# پارچە ئاڵتوونییەکانی کات

نووسینی: محمد فەتحوڵلا گولەن
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: ئەیلول - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٨٧)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

# پێشەکی

خوێنەری هێژا!

ئەم کتێبەی بەردەستت چەند وتارێکی هەڵبژێرراوی زانای موسڵمان "محمد فەتحوڵڵا گولەن"ی لەخۆ گرتووە. ئەمە دووەم کتێبی لەم جۆرەیە و پێشتریش لەژێر ناونیشانی "هەناسەکانی دڵ"دا کۆمەڵە وتارێکی ترمان بڵاوکردەوە، کاتی نووسرانی ئەم وتارانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەرچوونی گۆڤاری (سزنتی) لە ساڵی ١٩٧٩دا و ساڵانی دواتر، کە لە شێوەی سەروتاردا لەم گۆڤارەدا بڵاوبوونەتەوە. نووسەر تا ئەمڕۆش بەردەوامە لە نووسین لە گۆڤاری ناوبراودا. هەرچەندە ئەم وتارانە لە چەند کاتێکی جیا و شوێنی جیا و بارودۆخی جیادا نووسراون، بەڵام لەنێو خۆیاندا خاوەنی یەکێتی و هاوکارین و، جیهانبینی و بۆچوونی نووسەرەکەیان دەردەخەن لەمەڕ چەندین بابەتی جۆراوجۆری مرۆیی و، جیهانی و، ئایینی و، میتافیزیکی.

ئەم وتارانە زادەی خەمێکی قووڵ و، عەشقێکی فراوان و، دڵێکی بەسۆزن کە هەریەکەیان پاش ژان و ئازارێکی زۆر لەدایك بوون و، لە سەردەمانێکی تایبەتدا بیری نووسەر و کۆمەڵگای نووسەریان بە خۆیانەوە خەریك کردووە. هەر بۆیە چەند نووسینێکی گەرم و گوڕ و، تەڕ و پاراون و، لە هەناو و ویژدانی زانایەکی خەمخۆر و بەئەزموونەوە

هاتوونەتە دەر و، ئامانجیان دۆزینەوەی چارەسەرێکە بۆ هەموو ئەو کێشە و تەنگژانەی کە وڵاتی تورکیا و دنیای ئیسلامی بەتایبەتی و جیهان بەگشتی پێیانەوە گیرۆدەن. کەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت ئەگەر لە هەموو دێڕ و، پەرەگراف و، لاپەڕەیەکیدا دڵێکی بەجۆش و، ڕۆحێکی پڕ لە جوانی و، گیانێکی نوێ و زیندوو تیایدا نمایان بێت.

محمد فەتحوڵڵا گولەن موسڵمانێکی جیهانییە. هەروەك کوڕی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات و ئیسلامە و، لە باوەشیدا گەورە بووە و، بە جوانییەکانی گۆش بووە و، بە خەم و ئازارەکانی دڵی گوشراوە، بەهەمان شێوە خاوەنی زمانێکی جیهانییە و لە نزیکەوە ئاگاداری دواین ڕووداو و پێشهاتەکانی دنیایە و، گاهـ ڕەخنە لە لایەنە خراپەکانی شارستانێتیی نوێ دەگرێت و، گاهـ ڕەچەتە و چارەسەر و دەرمان پێشکەش بە زامە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤی نوێ دەکات. شایانی ئاماژەیە گولەن هەڵگری هەمان جیهانبینیی زانای گەورەی کورد (سەعیدی نوورسی) یە و، درێژەپێدەر و هێنەرەدی وەسێتی "کاری ئیجابی" ئەوە و، زمانێکی جیهانییە بۆ گەیاندنی پەیام و خەمەکانی ئەو. لەم ڕووەوە هیوادارین خوێنەرانی کوردزمانیش لێی بێبەش نەبن و، ئەگەر لە دەلاقەیەکی بچووکیشەوە بێت، ئاشنا ببن بە کەسایەتی هەمەڕەنگی ئەم زانایە.

محمد فەتحوڵڵا گولەن لە ساڵی ٢٠١٣ دا لە لایەن گۆڤاری "تایم"ەوە بە کاریگەرترین کەسایەتی ساڵ هەڵبژێرراوە و لە جیهاندا بە پشتیوانی کردن لە ئازادی و، مافی مرۆڤ و، بەها مرۆییەکان و، دیموکراسی و، ئاشتی و، لێبوردەیی و یەکتر قبووڵ کردن و، دیالۆگی نێوان ئایین و شارستانێتییە جیاوازەکان دەناسرێت. هەروەك بە هەڵوێستە

توندەکانی بەرامبەر بە هەموو جۆرەکانی تیرۆر دەناسرێتەوە و ڕاستەوخۆ لە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر، وتارێکی بەناوبانگی لە ڕۆژنامەی "نیویۆرك تایمز"ی ئەمریکیدا بڵاوکردەوە و تیایدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نە موسڵمانی ڕاستەقینە دەکرێت تیرۆریست بێت، نە تیرۆریستیش دەکرێت موسڵمانی ڕاستەقینە بێت. لە ناوخۆی تورکیا و دەرەوەیدا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە و نامەی ماستەر و دکتۆرا لەسەر بیر و بۆچوون و بەرهەمەکانی نووسراون. لە ژیانی شەخسی و ڕۆژانەشیدا سادەیی و، خاکی بوون و، خۆبەکەمزانین گرنگترین سیفەتیەتی. ئەمڕۆ ئەو خۆشەویست و لایەنگرانەی نووسەر کە ئیلهامیان لە ژیان و بۆچوون و جیهانبینی ئەو وەرگرتووە، بە هەر چوار لای دنیادا ، هەر لە ناوجەرگەی ئاسیاوە هەتا ئەمریکای لاتین و، هەر لە سیبیریاوە هەتا وڵاتە هەرە چەپەك و دوورە دەستەکانی ئەفریقا، هەر لە ئەوروپاوە هەتا ئاسیای ڕۆژهەڵات، بڵاوبوونەتەوە و پەیامی ئاشتی و، پێکەوەژیان و، فرەکلتوری و، بەها مرۆییەکان دەگەیەنن و، لە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانە و، ڕێکخراوی خێرخوازی و، سەنتەری دیالۆگەوە ڕوویەکی جوانی ئیسلام و موسڵمانان پیشان دەدەن.

خوێنەری ئازیز!

ئەم کتێبە پێکهاتووە لە چەند وتارێك کە لە نۆ کتێبی جیاوازەوە هەڵبژێرراون. ناوی کتێبەکانیش بەم شێوەیەن: چاخ و نەوە، مرۆڤ لە ناوەندی گەرداوی قەیرانەکاندا، بەرەو بەهەشتی لەدەستدراو، پارچە ئاڵتوونییەکانی کات، ڕۆژانی بەهار، فیکرە سەوزبووەکان، ئاسۆی ڕووناك، بزووتنەوەیەك کە مۆدێل و نموونەکانی لەناو خۆیدایە، هاوارەکانی

بێدەنگی. وەکو لە ناونیشانی کتێبەکانەوە دەردەکەوێت، لەڕاستیدا ئەم زنجیرە کتێبە هەموویان یەك کتێبی دوور و درێژن و تیایدا هەنگاو بە هەنگاو جیهانی فیکریی نووسەر دەناسێنن.

لە کۆتاییدا هیواداریـن ئەم کتێبە سوودی بۆ خوێنەرانی کوردزمان هەبێت و، لەم کلاورۆژنەیەوە ئاشنایان بکات بە دنیایەکی نوێ و، ببێت بە مایەی دەوڵەمەندکردنی پاشخانی فیکری و ڕۆحییان و، توێشوویەك بێت بۆ ئێمەش لە ڕێگای دوور و درێژی ئەبەدییەتدا. سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەش جێی خۆیەتی دان بەوەدا بنێین کە کارەکەمان ئاسان نەبووە و، هەوڵێکی زۆرمان داوە بۆ گواستنەوەی ئەو خۆشەویستی و، جۆش و خرۆش و، شیعرییەت و، ژان و، جوانییەی کە لە هەموو یەکێکی دێڕەکانییەوە دەچۆڕێت. بەڵام هیچ کارێك بێ هەڵە و کەموکورتی نییە و هیواداریـن لە داهاتوودا کەسانێکی شیاو دەربپەڕنە مەیدان و مافی تەواوی خۆی پێ بدەن. تۆش -ئەی خوێنەری هێژا!- بانگێشت دەکەین بۆ خوێندنەوەیەکی لەسەرخۆ و وردی ئەم کتێبە...

# فەزیلەت و
# بەختەوەری

# فەزیلەت و بەختەوەری

ئەو کەسانەی بەڵێنی بەختەوەری بە مرۆڤی ئێمە دەدەن پێویستە سەرەتا بە فەزیلەت بیرازێننەوە. هیچ گریمانێك نییە بۆ بەختەوەربوونی ئەو دڵانەی کە تینووی فەزیلەتن. لە ڕابردووەوە هەتا ئێستا ئەم بابەتە لە لایەن ژیرییە ساغەکانەوە بەم شێوەیە قبووڵ کراوە و، وەك دووانەیەك لە فەزیلەت و بەختەوەرییان ڕوانیوە. چونکە پێش لە هەر شتێکی تر فەزیلەت ناونیشانی سەرفرازبوونە بە جوانترین ڕەوشت و تەماشاکردنی هەموو بوونەوەرانە بە نیگای پڕ لە خۆشەویستی. مرۆڤی خاوەن فەزیلەت لەگەڵ هەموو بوون و بوونەوەراندا جۆرێك لە پەیوەندیی هەیە. لە دیدگای کەسێکی لەم جۆرەدا شەپۆلی ڕووداوەکان وەك شەماڵێکی بەهار کە خۆشیی بە دڵ دەبەخشێت تێدەپەڕن و، ڕۆحی ئەو پڕ لە کامەرانی و شادیی دەکەن. ئەو، لە لافاوی بەخوڕی کات و بوونەوەراندا، تەماشای تابلۆی نوێ و تازە دەکات و، هەمیشە سەرسام و هەردەم بەختەوەرە. نە هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرەکان و، نە بەدوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژەکان ناتوانن چێژەکانی ئەو تاڵ بکەن و خەم بە دڵی ئەو

بدەن. نەك هەر ناتوانن خەمباری بکەن، بەڵکو ئەو بە سەیرکردنی ئەو تابلۆیانەی کە هەموو دەمێك لە گۆڕان و تازەبوونەوەدان، هەمیشە لە چرکەساتی ئارامی و کامەرانیدا دەژی.

فەزیلەت پشت هەڵکردنی یەکجارەکی لە ئارەزووە مرۆییەکان و، تۆران لە هەموو بوونەوەران و، هەڵبژاردنی جۆرێك لە ژیانی زاهیدانەش نییە. تێگەیشتنێکی لەم شێوەیە دەربارەی فەزیلەت کە مرۆڤ لەو دنیایە دەبچڕێنێت کە تیایدا دەژی، ڕەشبینیی بەرهەم دەهێنێت و سەرچاوەی بەدبینییە. ئەمەش بە گوتەی ئیبسن "لەناوچوونی بەختەوەری"یە. لە هەمان کاتدا ئەم ترسە زۆر و نابەجێیە بەرامبەر بوون و بوونەوەران ئاماژە بەوە دەکات کە تاك تەنها بیر لە نەفسی خۆی دەکاتەوە و، ئاوێتە بووە لەگەڵیدا و، مەحرورمە لە هەستی جوامێریی، ئەم هەڵوێستە نالەبارەش نیشانەی تێگەیشتنی هەڵەیە لە ژیانی ئەخلاقیی و نەبوونی خەسڵەتی "ژیان لە پێناو کەسانی تردا" دەردەخات.

بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە گوایا فەزیلەت کەفیلی هەموو بەختەوەرییە جەستەیی و ڕۆحانییەکانە، ئەمەش بە هەمان شێوە هەڵەیە و ڕاست نییە. دەگونجێت مرۆڤێکی خاوەن فەزیلەت نەخۆش و هەژار بێت و لە پەرێشانیدا بتلێتەوە. لەوانەیە ستەم و، سووکایەتیی و، خیانەت لە کەسانی ترەوە ببینێت. دەکرێت ئەشکەنجە و، بەندیخانە و، ڕەهەندەیی بەسەردا بێت. لەکاتێکدا حەزرەتی مەسیح ستەمی لێ کرا و، سوقرات بەند کرا و، ئەپیکتیتۆس مافی خورا، کەچی ئەوان بەختەوەربوون... لەم ڕووەوە ئێمە زیاتر بەختەوەریی بە شتێك دەزانین لە ناو دڵدا و، بە بەهەشتێك دەیبینین کە مرۆڤ بە یارمەتی بیروباوەڕەکەی لە ڕۆحی

خۆیدا دروستی دەکات. بەڵێ، "ئیمان هەڵگری تۆوی بەهەشتێکی مەعنەوییە و، کوفریش هەڵگری زەققومی دۆزەخێکی مەعنەوییە..."[١]

فەزیلەت بریتییە لەوەی مرۆڤ سنووردارێتیی و، بێبایەخیی خۆی لەچاو بێسنووریی گەردووندا ببینێت و، لە بچووکیی خۆی تێبگات و، نرخێکی زیاتر لەوەی هەیە نەدات بە کەسایەتیی خۆی. ئەگینا گریمانێکی زۆر هەیە کە بە بەڵا و موسیبەتە جەستەییەکان شەکەت ببێت و، بە بەردەوامیی غرور و عیززەتی نەفسی بریندار ببێت و، بەهۆی ئەو هەڵپە نەزانانەوە کە بە هیچ جۆرێك تێر ناخۆن دووچاری نارەحەتی ببێت و، لە ناوەندی بارودۆخە نزم و سووکەکاندا بە یەکجاری بەختەوەری لەدەست بدات.

مرۆڤی خاوەن فەزیلەت ئەو مرۆڤەیە کە دەتوانێت بە دروستیی بیربکاتەوە. ئەو، "لەو شتانەدا کە چارەیان هەیە ناکەوێتە دەستەوسانیی و، لەو شتانەشدا کە چارەسەریان نییە گرفتاری ئاخ و ئۆف نابێت..." بەپێچەوانەوە لە بازنەی مومکیناتدا هەر شتێك لە دەستی بێت دەیکات بۆ خۆپاراستن لە شتە خراپ و زیانبەخشەکان. ئەگەر لە دەرەوەی سنووری ئیرادە و تواناکانیشیدا ڕووداوێکی بەسەرهات، ڕێگای تەسلیم بوون هەڵدەبژێرێت. وە کامەرانیی خۆی وەکو زۆرێك لە خەڵکی بە خۆپەرستیی و، ترسی سەروەت و سامان و، حەزی پلە و پایە و ناوبانگ، لێڵ ناکات...

---

١. ئەم وتەیە هی زانای گەورەی کورد (سەعیدی نوورسی)یە.

مرۆڤێك كە خاوەنی بیركردنەوەی تەندروستە هەر لە سەرەتاوە ئامادەیە بۆ ئەو بەڵا و موسیبەتانەی كە لە تواناماندا نییە و لە وزەمان بەدەرن و، ڕازییە پێیان، لەبەر ئەوە هەرگیز بەختەوەریی و لەزەتەكانی تاڵ نابن و تێكناچن. ئەو بە یارمەتی ئەم هەست و تێگەیشتنەی هەمیشە بەشی خۆی وەردەگرێت لە خۆشییە پاك و بێگەردەكان و، تام و چێژەكانی خۆشەویستی و، شەفەقەتی خێزان و، هەستەكانی وەك برایەتی و دۆستایەتی.

بەڵێ، ئەو چونكە هەمیشە لە ناحەقی كردن و، خیانەت كردن و، تۆڵە و، ڕق و، قین و، بەخیلیی بەدوورە، زۆربەی كات هەست بە بوونی شنەبای ڕێز و خۆشەویستیی دەكات لە چواردەوریدا و، هەموو كاتێك دڵخۆشە. ئەو، لەو خۆشەویستیی و پەیوەندییەدا كە هەیەتی لەگەڵ خێزانەكەی و، نیشتمانەكەی و، نەتەوەكەی و تەنانەت هەموو بوونەوەراندا، لە دەریای بێ كەناری خۆشەویستیدا هەست بە تام و چێژگەلێكی بێسنوور دەكات و، پێش ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە لەناو ناز و نیعمەتەكانیدا دەژی. ئەم حەزانە بریتین لە: حەزی هاوبەشیی كردن لە خۆشی كەسانی تردا.. حەزی چەشتنی لەزەتەكانی ئەوان لە ڕۆحدا.. حەزی سنگ دەرپەڕاندن لە ئازار و ناڕەحەتییەكانی ئەوان و كردنەوەی ڕێگاكانی بەختەوەریی بۆیان..

لە هەمان كاتدا فەزیلەت بریتییە لەوەی مرۆڤ هەروەك لەگەڵ كاتی ئێستادا پەیوەندیی هەیە، لەگەڵ ڕابردوو و داهاتووشدا دەستاوێژ گرێ بدات و، بە ڕۆح لەگەڵ ئەو مرۆڤە ناوازانەی ڕابردوو و داهاتوودا

بژی و، لە دڵی خۆیدا لایەنە جوانەکانیانی خۆشبوێت و، تێکەڵاو ببێت لەگەڵ پێشینانمان لە لایەك و نەوەکانی داهاتوومان لە لایەکی تر.

بەڵێ، "دڵ" بەم جۆری ژیانەی کە لە پەیوەندیدایە لەگەڵ سەرتاپای مرۆڤایەتی و گەردووندا، هەر لەم دنیایەدا دەگات بە بەختەوەریی ڕەها و بە ڕەهەندێکی هێندە فراوان کە ڕووداوە دەرەکییەکان ناتوانن کامەرانیی ئەو بشێوێنن.

ئەم پەیوەندییە قووڵەی کە لە نێوان فەزیلەت و بەختەوەریی ڕاستەقینەدا هەیە، بەشەرەفترین کەسایەتیی مرۆڤایەتیی[1] فێری ئێمەی کردووە. هەر ئەمەش ئەو بەختەوەرییەیە کە دڵان دەگەیەنێت بە دڵنیایی و ئارامیی دەبەخشێت بە ژیرییەکان. چونکە ئەم بەختەوەرییە لەسەر پتەوترین بناغەکانی فەزیلەت دامەزراوە لە چەشنی کامڵیی، خۆبەکەمزانیی، لێبووردەیی، داخستنی چاو لە ئاستی عەیبەی کەسانی تر و، نەبوونی ڕق و کین...

بەکورتی ئەم بەختەوەرییە کامەرانیی دڵ و ڕۆحە. هێندەش ڕەگداکوتاوە و پەیوەندییەکی ئەوەندە بەتینی بە ناوەرۆکی مرۆڤەوە هەیە، هیچ شتێکی تر ناتوانێت جێگاکەی بگرێتەوە. سەرجەم بەختەوەرییە ماددییەکان هەروەك هیچیان پێ نییە بۆ ئەم بەختەوەرییەی زیاد بکەن، بە هەمان جۆر ناشتوانن لە یادی مرۆڤی ببەنەوە.

خۆشبەختیی بۆ ئەو کەسانەی بە باوەڕ بەرزبوونەتەوە و بە فەزیلەتیش پڕچەك بوون!..

١. مەبەست لێی پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

# زانست

لەم ڕۆژگارەدا پێشکەوتنە زانستییەکان گەیشتوون بە ئاست و خێراییەکی وەها وەك بڵێی ئەم چاخە بووبێت بە سەردەمی ڕووداو و کاروبارە سەرسووڕهێنەر و چاوەڕوان نەکراوەکان. دەتوانین بڵێین ئەو دۆزینەوە نوێیانەی کە زانست لەم چارەکە سەدەیەی دواییدا پێشکەشی مرۆڤایەتیی کردووە، لە هەموو ئەو دۆزینەوانەی تر زۆرترە کە پێشتر و بەدرێژایی مێژوو پەییان پێ براوە. ڕۆژانە لە مەیدانێکی فراوانی هەر لە جیهانی بچووکەوە هەتا جیهانی گەورە چەندین شتی تازە و نوێ دەخرێنە مەیدان و، چەندین خاڵی نەزانراو و تاریك سەبارەت بە بوون و بوونەوەران ڕووناك دەبنەوە. هەر لە گەردیلەکانەوە هەتا گەلەستێرەکان، لە جیهانی زیندەوەرانەوە هەتا مرۆڤ، لە ئەلەکترۆنیك و تەکنەلۆجیاوە هەتا لەیزەر، شایەتحاڵی چەندین داهێنان و دۆزینەوەی نوێ دەبین کە ڕۆژانە بەهۆی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە بە گشت لایەکی دنیادا بڵاودەبنەوە و، ئێمەش یان دڵمان پێیان خۆش دەبێت، یان ترس و خەم داماندەگرێت.

نابێت ئەوەش بە دوور بزانرێت ئەم زانست و تەکنەلۆجیایەی کە

بەم شێوە و خێراییە لە سنووربەدەرە پێشدەکەوێت، لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا چەند دۆزینەوەیەك بەرهەم دەهێنێت کە کاریگەریی دەبێت لەسەر کۆی سیستەمی بیرکردنەوە و، بیروباوەڕ و، خودی تێگەیشتنمان لە زانست. کاتێك ئاوڕ بۆ ڕابردووی نزیکی خۆمان دەدەینەوە، دەبینین لە دوێنێوە بۆ ئەمڕۆ زۆر شت گۆڕاوە. تێگەیشتنی گالیلیۆ دەربارەی "شوێن" و، تیۆریی "ڕاکێشانی گشتی"ی نیوتن کە هەتا دوێنێ بەلای هەموو کەسێکەوە بە شتانێکی چەسپاو و نەگۆڕ تەماشا دەکران، ئەمڕۆ شوێنی خۆیان بۆ "ڕێژەگەرایی" چۆڵ دەکەن و، هەریەکەیان بوون بە چەند تیۆرییەکی مێژوویی. بیر و بۆچوونی ئەوەی کە گوایە مادده سەرچاوەی هەموو شتێك بێت، هەر لە کۆنەوە زۆرێك لە خەڵکی بە گومانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە. ئەمڕۆ دەبینین کە بە ئەندازەی مادده، ئەودیوی ماددەش بە خاسیەتە تایبەتەکانی خۆیەوە، بووە بە کەرەستەیەك بۆ لێکۆڵەران و توێژەران. وا دەردەکەوێت لە داهاتوویەکی نزیکدا و لە دامەزراوە زانستییەکاندا بەقەدەر مادده، ئەنتی مادده و، بە ئەندازەی ئەتۆم، ئەنتی ئەتۆمیش گرنگییان پێ دەدرێت و دەبن بە بابەتی هاوبەشی لێکۆڵینەوەکانیان و، لەگەڵ هەموو باسکردنێکی فیزیکدا، بێگومان مێتافیزیکیش تاووتوێ دەکرێت.

زانست خۆی بەو شتانەوە سەرقاڵ دەکات، کە بە هەستەکانمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین. ئەو ڕاستییانەش کە دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی ئەمانەوە لە ڕێگەی ئەزموون کردنەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەیان دەدات. ئەو زانیارییانەش کە بە هەستەکان دیاری نەکراون و، بە میتۆدی زانستیی پشتڕاست نەکراونەتەوە، لە بونیادی خۆیدا جێیان ناکاتەوە. بۆ

نموونه جگه له چۆنێتیی ئه‌و شتانه‌ی كه ده‌یانبینین، كه‌س ناكه‌وێته گومانه‌وه له‌وه‌ی كه هه‌ریه‌ك له شته بینراوه‌كان حه‌قیقه‌تێكی چه‌سپاوی تایبه‌ت به خۆیان هه‌یه. به هه‌مان جۆر بۆ ئه‌و شتانه‌ی ده‌یانبیستین و، ده‌ستیان لێ ده‌ده‌ین و، ده‌كه‌ونه ناو چوارچێوه‌ی هه‌سته‌كانی ترمانه‌وه، ده‌توانین هه‌مان شت بڵێین... بوونی بواری "موگناتیسیی" و "ئه‌له‌كترۆنیی"ش كه به هه‌سته‌وه‌ره‌كانمان ناتوانین پەییان پێ ببه‌ین، به‌هۆی موگناتیس و هه‌ندێك ئامێری تایبه‌تی ترەوه هه‌وڵ ده‌ده‌ین پێناسه‌یان بكه‌ین. ئه‌مڕۆ زانست به‌و ئامێر و كه‌لوپه‌لانه‌ی كه خاوه‌نیه‌تی ته‌نها ده‌توانێت ئه‌مه‌نده ده‌ست نیشان بكات و، ناتوانێت بچێته ده‌ره‌وه‌ی سنووری بواری "موگناتیسیی" و "ئه‌له‌كترۆنیی" و "ته‌ن - ڕاكێشان"ه‌وه. هه‌ر كاتێك چه‌ند ئامێر و كه‌ره‌سته‌یه‌كی نوێ دۆزرانه‌وه بۆ سه‌لماندنی بوون و چۆنێتیی جیهانه‌كانی تری ده‌ره‌وه‌ی ئه‌م ناوبراوانه، بێگومان ئه‌وانیش ده‌بن به چه‌ند بابه‌تێك بۆ لێكۆڵینه‌وه زانستییه‌كان.

له‌م ڕووه‌وه لاف لێدانی ئه‌وه‌ی گوایه ئه‌مڕۆ زانست ده‌وراندەوری هه‌موو شتێكی داوه و، گه‌یشتووه به ئامانجی كۆتایی خۆی، هه‌م هه‌ڵه‌یه‌كی گه‌وره‌یه و، هه‌م مانای نه‌بینینی ئه‌و شتانه‌یه كه هه‌تا ئێستا زانسته‌كان پێش چاویان خستووه. له ڕاستیدا كاتێك ئه‌مڕۆ ته‌ماشای دۆزینه‌وه و داهێنانه نوێیه‌كانی زانست ده‌كه‌ین، تێده‌گه‌ین ئه‌و شتانه‌ی ده‌یانزانین له‌چاو ئه‌و شتانه‌دا كه نایانزانین له حوكمی "هیچ"دان. بانگه‌شه كردن بۆ پێچه‌وانه‌ی ئه‌مه، هه‌م دژی واقیعه و، هه‌م بریتییه له ڕازی بوون به به‌شی ئێستا و بیرێكی كۆنه‌په‌رستانه‌یه. له هه‌موو سه‌رده‌مێكدا ئه‌وانه‌ی زانیاریی ڕۆژگاری خۆیان به دوایین لوتكه داناوه كه زانست

پێی بگات، بەم بیرکردنەوەیەیان ڕێگای لێکۆڵینەوەی زانستییان گرتووە و، سیمای ژیانی کلتوورییان ڕەش کردووە.

لەبەر ئەم هۆیە ئێمە پێمان وایە کە سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن و ڕەخنە گرتن لەو شتانەی تا ئەمڕۆ فێریان بووین و دەیانزانین و، جارێکی تر هەڵسەنگاندنی زانیارییە کۆنەکانمان لەژێر ڕۆشنایی دۆزینەوە تازەکان و، لەو ڕووەوە کە هەم هەڵەکانمان ڕاست بکەینەوە و، هەم دەرگایەکیش والا بکەین بۆ ئەو شتانەی کە گیرمان خواردووە تیایاندا و گەیشتووین بە بنبەست، کارێکی یەکجار پێویستە.

بەڵێ، حاڵەتی گشتیی ئاسمانەکان و زەوی و، پەیوەندییان بە یەکترەوە و، هاتنی شەو و ڕۆژ بە ڕێکوپێکیی بەدوای یەکدا و، چۆنێتیی و تایبەتمەندیی بوونەوەرە گیاندار و بێگیانەکان لە جیهانی تایبەتی خۆیاندا و، جووڵە و فەرمان و ئەنجام و ئامانجی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و ئاژەڵان و، پاشان خاك و ئاو و پێکهاتەکانیان و، پەیوەندییان بە زیندەوەرانەوە.. پێویستە هەموو ئەمانە دیسان و جارێکی تر هەڵبسەنگێنرێن و لەژێر ڕۆشنایی میتۆدە مۆدێرنەکاندا شیکار بکرێن. تەنها بەم شێوازە دەگونجێت ئەو تیۆرییانەی کە میتۆدە زانستییەکانی لێکۆڵینەوەی تەندروست نەیانسەلماندووە و، ئەو یاسایانەش کە بەهۆی بۆچوونی هەڵەوە دانراون، سەرلەنوێ چاویان پێدا بخشێنرێنەوە و، هەڵەکانیان ڕاست بکرێنەوە.

ڕەچاوکردنی یاساکانی لێکۆڵینەوەی زانستیی تەندروست سەبارەت بە زانایەك، مانای ڕێز گرتنە لە شەرەفی زانست. ئەوانەی لافی سەرقاڵبوون

بە زانستەوە لێ دەدەن و لە هەمان کاتدا دامەزراوە زانستییەکان بە تیۆرییە نەسەلمێنراوەکانەوە خەریك دەکەن، هەم خەڵکانێکی زۆر دەخەڵەتێنن و، هەم لاقەی شەرەفی زانستیش دەکەن.

یاسای لێکۆڵینەوەی زانستیی گەر کورت و پوخت بکرێتەوە بەم جۆرەیە: سەرەتا ئەو بابەت و شتەی دەمانەوێت لەبارەیەوە بزانین و فێرببین بە ڕوونی دیاری دەکرێت، پاشان چاو دەخشێنرێت بە ئەنجامی هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەدا کە پێشتر و لەو بوارەدا ئەنجام دراون، پاشان ئەو ئەنجامانە دەست نیشان دەکرێن کە لە کۆی هەڵسەنگاندنی ئەم زانیارییانەوە بە دەست هاتوون، بۆ دڵنیابوونیش لەم ئەنجامە ناوبراوانە دەست دەکرێت بە کۆمەڵێك ئەزموونی نوێ بە مەبەستی سەلماندنی ڕاستێتییان، ئەگەر ئەو تیۆرییەی پێشتر دانراوە بە یارمەتی تاقیکردنەوەکان پشتڕاست نەکرایەوە، دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتا و، لێکۆڵینەوەی جیاوازی تر دەکرێت و، داتا و زانیارییەکان کۆدەکرێنەوە و، زانیارییە کۆن و تازەکان دەخرێنە پاڵ یەك و، لەژێر ڕۆشنایی ئەم زانیارییانەدا شێوە و شکڵێکی نوێ دەدرێت بە تیۆرییەکە. بەم جۆرە ئەو شتانەی کە ڕاستێتییان بەهۆی تاقیکردنەوەکانەوە سەلماوە تۆماردەکرێن، پاشان ئەگەر ویسترا ڕاستییەك بکرێت بە یاسایەکی جێگیر، لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەوەوە دەکرێت کە داخۆ دەگونجێت ئەو ڕاستییە بگشتێنرێت یان نا و، پەیوەندیی ئەو ڕاستییە بە ڕووداوە هاوشێوەکانیەوە هەڵدەسەنگێنرێت.

ئەم شێوازی لێکۆڵینەوەیەی کە میتۆدی مۆدێرنیش پاڵپشتیی لێ دەکات، بریتییە لە شێوازێکی "بابەتیی" بۆ توێژینەوە زانستییەکان. لەسەر ئەم بنەمایە، بانگەشە کردن بۆ ڕاستێتیی و جێگیریی شتێك

که بەم شێوازە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکرابێت و، پاشان ڕەت کردنەوە و ئینکاریکردنی هەموو ئەو شتانەی کە پێچەوانەی ئەم بانگەشەیەن، بە هیچ جۆرێك کارێکی زانستیی نییە. ئەو بیر و بۆچوونانەی کە لەسەر گومان و پێشبینیی بنیات نراون، تەنها بیردۆزێکن و، ئەو یاسا گشتییانەش کە لەسەر پشتی بیردۆزەکان دامەزراون، هیچ نین جگە لە خەڵەتان و بەهەڵەداچوون. هەروەك لە گومان و پێشبینییەوە ناگەین بە ڕاستییە زانستییەکان، بە هەمان جۆر و بە پشت بەستن بەمانە، ناکرێت ئینکاریی ئەو حەقیقەتانە بکرێت کە لە ڕێگەی بینین یان سەرچاوەی هەواڵی تەندروستەوە پشتیان دەگیرێت، یان بە شێوازی تایبەتی خۆی سەلمێنراون.

# ژن له‌ چوارچێوه‌یه‌کی
# ته‌سکدا

# ژن لە چوارچێوەیەکی تەسکدا

ژن لە ڕوانگەی توانا و لێهاتنە ناوەکییەکانیەوە نموونەیەکی باڵای شەفەقەتە. ئەم شەفەقەتەش لە سروشت و بەدیهاتنیەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم سروشتە پاك و بێگەردە بە مەرجێك بە دەست تێوەردانە چەوتەکان پیس نەبووبێت، هەمیشە بیر لە شەفەقەت دەکاتەوە و، شەفەقەت دەڵێت و، لەگەڵ شەفەقەتدا هەڵدەستێت و دادەنیشێت و، بەدرێژایی تەمەنی بە نیگای پڕ لە شەفەقەتەوە لە چواردەوری خۆی دەڕوانێت و، پێکی شەفەقەت دەرخواردی هەموان دەدات. لەو کاتەدا کە هەموو کەسێك بە شەفەقەتەوە لەباوەش دەگرێت و شەربەتی شەفەقەت پێشکەشی هەموو لایەك دەکات، وەك پێویستیی و داخوازییەکی ناسکی و دڵسۆزییەکەی، هەمیشە بەدەم ئازارەوە هەنسك دەدات. وەك شەقشەقە دەلەرزێت بەژوور سەری هەموو ئەوانەی دەوروبەریەوە، هەر لە دایك و باوك و، برا و خوشك، هەتا هاوڕێ و هەموو نزیکەکانی، کاتێکیش وەرزی تایبەتی خۆی هات هیی هاوسەرەکەی و منداڵەکانی. هاوبەشی خۆشی و چێژ و ئاسوودەییان دەبێت و، وەك گوڵ دەکرێتەوە و، زەردەخەنە

بە چواردەوریدا دەبەخشێتەوە. ئەگەر لەوانیشدا ئازار و خەم و خەفەت ببینێت، وەك گەڵایەك سیس دەبێت و، زەرد هەڵدەگەڕێت و، بەدەم ئازارەوە دەتلێتەوە.

هەموو کاتێك دەخوازێت شتانی جوان ببینێت و، لەناو جوانییەکاندا هەستێت و دانیشێت، بەڵام ئەوەندە هەیە هەندێك جار ئەوەی ئومێدی دەکات دەیدۆزێتەوە و، جاری واش هەیە دەستی ناکەوێت. کاتی وا هەیە ڕەشەبا هەردەم بەتوندی هەڵدەکات و، هەموو ئەو شتانە دەخاتە لەرزە کە ئەو دڵی پێیانەوە وابەستەیە، ئا لەم کاتانەدا پێ بخاتە هەر جێگایەك دەناڵێنێت و ڕەنج دەکێشێت. زریان و گڕکانەکان لە ناوەوەیدا قوڵپ دەدەن و، لە ڕێگەی فرمێسکەکانەوە هەناسەیەك دەدەن. جاری واش هەیە بەو جوانییانەی کە لە ئاسۆیدا سەوز دەبن، ڕێك وەك منداڵێك دڵی خۆش دەبێت و، جامی کەیف و خۆشی پێشکەشی هەموان دەکات.

ژنێك کە لە ئاسۆی ڕۆحیدا هاوسەرێکی گونجاوی دیوەتەوە و بە منداڵەکانی تینوێتیی هەمیشەیی خۆی شکاندووە، جیاوازییەکی نییە لەگەڵ حۆرییەکانی بەهەشتدا و، لانەیەکیش کە لە دەوری وەها ژنێك دروست بووە هیچی لە فیردەوس کەمتر نییە. بێگومان ئەو منداڵانەش کە لە بەهەشتێکی وادا و بە مژین و قومدان لەو شەفەقەتە گەورە دەبن، لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا جیاوازییەکیان نییە. بەڵێ، کەسێك گەیشتبێت بە بەختەوەریی پەروەردەبوون لە خانەیەکی وادا، وەك ئەوەی سەری لەناو بەهەشتەکاندا بێت، بە خۆشی و شادییەکی ئاخیرەتییەوە ژیان بەسەر دەبات و، خەندە بەسەر چواردەوریدا دەبەخشێتەوە.

هەرچەندە لە هێلانەیەکی لەم جۆرەدا لاشە و جەستەکان جیا جیا

دەردەکەون، بەڵام لەڕاستیدا تەنها یەك گیان فەرمانڕەوایە بەسەر هەموو شتێك و هەموو کەسێکدا. ئەم گیانەی کە هەموو کاتێك لە ژنەوە هەڵدەقوڵێت و هەموو خێزانەکە دەگرێتەوە، لەڕووی مانەوە وەك سیحرێك و وەك ڕۆحێك هەمیشە هەموان هەستی پێ دەکەن و، بەرەو کوێ بیەوێت ئاراستەیان دەکات. ژنێکی پیرۆز کە ئاسۆی دڵی تاریك نەبووبێت و بەردەمی ڕۆحی کراوە بێت، لە سیستەمی خێزاندا وەك ئەستێرەی باکور وایە، هەمیشە لە جێگای خۆیدایە و بەدەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، بەڵام تاکەکانی تری خێزان بوونیان لە چوارچێوەی ئەودا شکڵ و شێوە وەردەگرێت و، لەگەڵ وابەستەبوونیان بەوەوە بەرەو ئامانجەکانیان هەنگاو دەنێن. بەڵێ، پەیوەندیی هەموو کەسێك بە هێلانەکەیەوە کاتیی و گوێزەیی و سنووردارە، بەڵام ژن کارێکی تری هەبێت یان نەیبێت، لە چێشتخانەکەیدا کە هەویری شەفەقەت و بەزەیی و خۆشەویستیی پێکەوە لەسەر ئاگرن، هەمیشە لە ناوەڕاستی ماڵەکەیدا قنج بەپێوە وەستاوە و، ئای چ شتانێك دەکوڵێنێت و پێشکەشی هەستەکانمانی دەکات..!

ژنێك کە بەتەواوەتی هەست و بیرکردنەوەکانی ئاراستەی ئەبەدییەت کردووە شتانێك دەدات بە گوێی ڕۆحماندا کە هیچ مامۆستا و ڕێنمونیکارێك ناتوانێت پێی هەستێت و، دڵەکانمان بەو نەخشە هەرە جوانانە دەڕازێنێتەوە کە "کات" ناتوانێت زەردیان بکات و، وزەیەکی دەوڵەمەندی وەها دەبەخشێت بە ئەستمان بتوانین لە ژیانی ئەودیوماندا دنیاکانی پێ تەی بکەین. ئێمە لە حزووری "مرۆڤی کامڵ"ی لەم جۆرەدا هەست بە ڕژانی بەزەیی و، شەفەقەت و، شیعری ئەودیو ئاسمانەکان دەکەین بۆ ناو ڕۆحمان و، لە قووڵایی دڵماندا هەمیشە بە ئەشوەی ئاخیرەتیبوون مووچڕکە بە گیانماندا دێت.

بەڕای ئێمە ژن، بەتایبەت لە ڕەهەندی دایکایەتییەوە، بە ئەندازەی ئاسمانەکان فراوان و، بەقەدەر ئەستێرەکانی ئاسمانیش هەست و بیرکردنەوەکان لەناو دڵیدا قوڵپ دەدەن و لەم ڕووەوە خولگەی بەزەیی و هەستەکانە. ئەو هەمیشە گونجاوە لەگەڵ بەختی شیرین و تاڵیدا و، نێوانی خۆشە لەگەڵ چێژ و ئازارەکاندا و، یەکانگیر بووە لەگەڵ خۆشی و ناخۆشییەکاندا و، هەردەم داخراوە بەڕووی ڕق و نەفرەتدا و، لە هەموو دۆخێکدا بەدوای ئاوەدانکردنەوە و بنیاتناندا دەگەڕێت و، بێگەردترین هەوێنی جێنشینیی خوای گەورەیە لەسەر زەوی و، پوختە و پێڕستی ناسکی و نەرمونیانیی مرۆڤانەیە. بەتایبەت ژنێکی بەختەوەری وا کە لە ڕێگەی بیروباوەڕیەوە دەرگاکانی دڵی بەڕووی ئەبەدییەتدا والا کردووە، لە خاڵێکی ئەفسووناویدا کە بریتییە لە تێکەڵەیەك لە جیهانەکانی ماددە و مانا و، لاشە و ڕۆح، خاوەنی پلە و پایەیەکی هێندە بەرز و ڕووناکە و لە سەروو توانای تێگەیشتنەوەیە کە تەنانەت بەرزترین ئەو پایە و پێگانەش کە دوای ئێرە پێی دەبەخشین، لەچاو بەها ڕۆشنەکانی خۆیدا کە وەك خۆر دەدرەوشێنەوە -چونکە ئەم وەسفانە زیادەڕەویی دەکەن لە پێگە و توانا و لێهاتنەکانیدا و پایەی ڕاستەقینەی خۆی لەکەدار دەکەن- وەك چەند مۆمێکی کوژاوەیان لێ دێت.

لە دنیای بیرکردنەوە و هەرێمی بەهاکانی ئێمەدا ژن گرنگترین ڕەنگی ڕووداوی بەدیهێنان و، ئەفسووناویترین و بەپیتترین ڕوکنی جیهانی مرۆڤایەتی و، سێبەرێکی پڕاوپڕی جوانییەکانی بەهەشت لە ماڵەکانماندا و، باشترین و ساخڵەمترین گەرەنتییە بۆ بوون و مانەوەمان. پێش ئەوەی ئەو بەدیبهێنرێت ئادەم پێغەمبەر (عَلَيهِ السَّلَام)

تەنیا و، ژینگە بێگیان و، ئادەمیزاد مەحکوومی لەناوچوون و، خانە و لانەش هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ کلۆری ناو داران و، مرۆڤیش لە فانۆسی تەمەنی خۆیدا زیندان کرابوو. لەگەڵ ئەودا جەمسەری دووهەم دروستبوو و جەمسەرەکان پێکەوە بەستران. "بوون" بە دەنگ و ڕەنگێکی جیاواز ڕازایەوە و، "مرۆڤی تەنیا" گۆڕا بە "جۆر" و، بوو بە گرنگترین کەرەستەی گەردوون و، نرخێکی یەکجار مەزنی بەخشی بە هاوسەرەکەی.

گەرچی ژن لەڕووی دەروونناسی و کارئەندامناسییەوە خاوەنی سروشتێکی جیاوازە و خاسیەتی تایبەت بە خۆی هەیە، بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نایەت کە پیاو لە ژن باڵاترە، یاخود ژن لە پیاو کەمترە. ئەگەر وەکو توخمەکانی هایدرۆجین و ئۆکسجینی ناو هەوا لە پیاو و ژن بڕوانین، هەردووکیان لەڕووی پێگە و تایبەتمەندییانەوە تا بڵێی گرنگن و، بە هەمان ئەندازەش موحتاجی یەکترن. ئەگەر توخمەکانی هەوا بە یەکتر بەراورد بکرێن، وتنی "هایدرۆجین بەنرخترە." یاخود "ئۆکسجین گرنگترە" چەند بێمانایە، بەهەمان شێوە بەراوردکاریی لە نێوان ڕۆڵی ژن و پیاودا نەگونجاو و بێمانایە. بەڵێ، پیاو و ژن لەڕووی بەدیهاتن و فەرمانبەرییان لەسەر زەوی هیچ جیاوازییەکیان لە نێواندا نییە و، دوو ڕووی جیاوازی یەك شتن کە پێویستیان بە یەکترە.

"ژن موحتاجی پیاو و، گەنج موحتاجی پیر و، کەمان موحتاجە بە تیر
هەموو پارچەکانی عالەم کوللەن موحتاجی یەکترین"

بەڵام داخۆ ژن هەموو کاتێك و لە گشت گۆشەیەکی ئەم سەرزەمینەدا بەم شێوەیە نرخ و بەهای زانراوە؟ باوەڕ ناکەم، فەرموون ئێوە و چەند

نموونەیەك كە لە كتێبێكی بەڕێز (ش. جان) هێناومانە: لە هەندێك جێگا هەرگیز ژن مافی شووکردن و وەرگرتنی میراتی نەبووە و خاوەنی بچووکترین مافە مرۆییەکانی تریش نەبووە. نەك هەر خاوەنی مافە مرۆییەکان نەبوو، بەڵکو وەك بوونەوەرێكی زیانبەخش تەماشا دەكرا كە لە ژەهر و، مار و، مردن و تاعوون زیانی زیاترە. (ئەمە وێنەی ژنە لای ویداییەکان...) لە هەمان ناوچەدا بە گوێرەی بیروباوەڕێكی چەوتی تر، جەخت لەوە دەكرێتەوە كە ژن شوێنكەوتەی هەستەکانییەتی و، دەبێت كاتێك مرۆڤ بەر چاوی كەوت نەیبینێت، ئەگەر بەناچاریی بینیشی قسەی لەگەڵدا نەكات، ئەگەر قسەشی لەگەڵدا كرد مرۆڤ خۆی لێ بەدوور بگرێت! (ئەمە ئەو وێنە ڕوون و ئاشكرایەیە كە لە گفتوگۆ بەناوبانگەکەی نێوان بودا و ئامێنداوە هەڵیدەهێنجێنین...)

لە جێگایەكی تردا پیاو فەرمانڕەوای ڕەهای ناو خێزانە و، كچانیش چەند خزمەتكارێكی داماون لەناو ماڵدا و، تەنانەت جاری وابوو وەك دیل لە لایەن باوكیانەوە دەفرۆشران. گوایە لەڕاستیدا ئەوان شایانی ئەم جۆرە مامەڵەیە بوون، چونكە ژن پێغەمبەر ئادەمی هەڵخەڵەتاند و پاڵی پێوەنا بەرەو خراپە. لەم ڕووەوە پێویست بوو نەفرینی لێ بكرێت. (ئەمە چوارچێوەی بڕیاری هەندێك لە سەرچاوە ئیسرائیلییەكانە سەبارەت بە ژن...)

لە دنیایەكی تریشدا، ئەو بە مرۆڤ ئەژمار نەدەكرا و، ناوی لێ نەدەنرا و، بە ژمارەکانی "یەك، دوو، سێ" بانگی لێ دەكرا و، تەنانەت وەك بەراز تەماشا دەكرا. (ئەم تابلۆ بێزاركەرەی كە وامان لێ دەكات هێڵنجمان بێتەوە، لە "چین"ی كۆنەوەیە...)

لە شوێنێکی تری ئەم دنیایەشدا، ئەو کارگەیەك بوو بۆ دروستکردنی منداڵ و بریتیی بوو لە کەرەستەیەکی هاوبەشی کەمنرخ. (ئەم جیهانبینییەی کە تایبەتە بە یۆنان و رۆمای کۆنەوە، چەندین شتی تریش هەیە کە ئەدەب و رێز رێگەمان پێ نادات لێرەدا باسی بکەین...) ئەم وتەیەش هیی یەکێکە لە بیرمەندە هەرە باڵاکانی ئەم کلتوورە "ژن دەرگای دۆزەخە و تەنها کەرەستەیەکە." (ئەمە بە ناوی ئەفلاتونەوە تۆمار کراوە...) "ژن لەڕووی بەدیهاتنەوە پیاوێکی نیوەیە." (ئەمەش وتەی ئەرستۆیە.) "ژن بۆ ئەوە دروستکراوە تا پیاوان نەتوانن کاری مەزن ئەنجام بدەن، ئەگەر ئەو بەدینەهێنرایە پیاوان دەبوون بە خوا." (چیچێرۆ) هەتا سەردەمی هێنریی هەشتەمیش (١٥٠٩ - ١٥٤٧) لەبەرئەوەی گوایە ژن هۆکاری یەکەم گوناه بوو لە بەهەشتدا، نەیدەتوانی دەست لە ئینجیل بدات! لە کەشوهەوایەکی لەم شێوەیەدا ئەم جۆرە بیرکردنەوانە باو بوو: "ژن -حاشا- هەڵەیەکی بەدیهاتنە." (میڵتن، خاوەنی کتێبی "بەهەشتی لەدەستدراو") ئەم وتەیەی کە لە زاری بەناو پیاوچاکێکەوە هاتووەتە دەر، مووچڕکە بە جەستەدا دەهێنێت "ئەگەر ژنان لە دوارۆژدا بە هەمان نارەزووە جەستەییەکانیانەوە زیندوو بکرێنەوە، دەترسم لەوێش پیاوان هەڵبخەڵەتێنن و بەلاڕێدا بیانبەن." (هیوادارم ئەمە قسەیەك بێت و بە دەمی سەینت ئۆگستینەوە هەڵبەسترابێت)

لە سەردەمی مۆدێرنیشدا سووکایەتی کردن بە ژن بە هەمان جۆر بەردەوام بووە، نیچە بە وتنی "کاتێك لەگەڵ ژنێکدا قسە دەکەیت، لەبیرت نەچێت قامچییەك بە دەستەوە بگریت!" وەك بڵێی بووە بە وەرگێڕی بیر و بۆچوونی جیهانێك.

تۆڵستۆی له دەفتەری یادەوەرییەکانیدا نووسیویەتی "زۆر خۆشحاڵم بەوەی خێزانم پێکەوە ناوە. بەختەوەریی ناو خێزان وەك خۆر ڕۆحم ڕووناك دەکاتەوە." ئەمەش وتەیەکی ڕاستە و له جێی خۆیدایەتی. بەڵام پاش ماوەیەك لەسەر زاری یەکێك له کارەکتەرەکانی ڕۆمانێکیەوە دەڵێت "قەت نەخەڵەتابیت ژن بهێنیت، هاوسەرەکەت دەبێت بە ڕێگر له بەردەم ئەنجامدانی کاری مەزندا. پەیوەندییەکانت دەخاتە ژێر فشارەوە و دەتگۆڕێت بە بوونەوەرێکی نزم و بێنرخ. چونکە ئەو خۆی بێنرخە، دەیەوێت لە نرخی مێردەکەشی کەم بکاتەوە." بەم شێوەیە دەریدەخات کە بە ڕاستیی چۆن له ژن دەڕوانێت.

نیمچەدورگەی عەرەبیش پێش هاتنی ئیسلام و له سەردەمی نەفامیدا بەنزیکەیی له هەمان دۆخدا بوو، هاتنە دنیای ژن و، گەورەبوون و گەورەکردنی و، پاشان شووکردنی، هەریەکەیان تراژیدیایەك بوو بۆ خۆی. منداڵی کچ وەك کۆڵێك بەسەر شانی خێزانەوە تەماشا دەکرا و، لە لایەکی تریشەوە هەبوونیان لە خێزاندا وەکو سەرچاوەی شەرم و شوورەیی وابوو، تەنانەت لە هەندێك ناوچەدا زیندەبەچاڵ دەکرا!

کاتێك ئیسلام پەیامی ژیانی هەتاهەتایی بۆ هەموو مرۆڤایەتی هێنا، (قسە و بیر و بۆچوونەکان دەربارەی ئەم بابەتە دەکرێت له کتێبێکی سەربەخۆدا تاوتوێ بکرێت و له ئێستادا تەنها پوختەیەکی کورتی باس دەکەین) هەموو ئەو مافانەی بۆ ئافرەت گێڕایەوە کە لێی زەوت کرابوو، بە ئاشکرا خستییە ژێر پارێزگاریی خۆیەوە و، یەکەم دینە کە چەندین یاسای مەحکەمی لەم ڕووەوە بڕیار داوە. قورئانی پیرۆز بە فەرمانی:

﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ (البقرە: ٢٢٨)[١]

هیچ جێگایەکی بۆ چەندوچۆن نەهێشتووەتەوە و، دەستی خستووەتە سەر ئەم ڕاستییە و، ژنی بەرز کردووەتەوە بۆ ئەو پێگە ڕاستەقینەیەی کە لە نەخشەی بەدیهێناندا بۆی دیاری کراوە. شانازیی مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە وتاری ماڵئاواییدا فەرمووی: "ئامۆژگاریتان دەکەم ڕەچاوی مافی ئافرەتان بکەن و لەم بابەتەدا لە خوا بترسن، ژنان ئەمانەتی خوان لای ئێوە." لەو سەردەمە شوومەدا کە ژن وەك شمەکێك کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا، بەرزکردنەوەی ژن بۆ ئاستێك کە ڕێزی لێ بگیرێت، سەبارەت بە دنیای ژنان ڕووداوێکی مێژوویی زۆر گرنگە. لە قورئان و سوننەتدا پێگە و مافەکانی ئافرەت هێندە ڕوون و ئاشکرا باس دەکرێت، ئەگەر بڵێین ئەو بەهۆی ئیسلامەوە لە کۆیلایەتیی ڕزگاری بووە، ئەم وتەیەمان بە زیادەڕەویی ئەژمار ناکرێت.

کەسانی خاوەن ویژدانیش لەم ڕووەوە بە هەمان شێوە بیردەکەنەوە. دێمۆمبین، کە یەکێکە لەو بیریارانەی لە جیهانی ئیسلامدا زۆرێك دەیناسن و وەکو سەرچاوە بۆی دەگەڕێنەوە، دەڵێت "قورئان لە بابەتی مافەکانی ئافرەتدا کۆمەڵێك بنچینە و بناغەی وای دامەزراندووە کە لە یاسا ئەوروپییەکانی ئەم سەردەمە گونجاوترن." ستانلی لەین پوڵ کە لێکۆڵەرێکی بەناوبانگی ترە، دەڵێت "ئەو گۆڕانکارییەی ئیسلام لە بواری مافەکانی ژناندا هێنایە دی، هیچ یاسایەکی تر نەیتوانیوە پێی

١. واتە: هەروەك پیاوان هەندێك مافیان بەسەر ژنانەوە هەیە، ژنانیش مافیان بەسەر پیاوانەوە هەیە.

بگاتەوە.“ و لەم ڕووەوە دان بە خاڵێکی زۆر گرنگدا دەنێت. ئۆباڵدیش لەم بارەیەوە دەڵێت ”ڕزگارکردنی ئافرەت لە کۆیلایەتی و سەندنەوەی مافە زەوتکراوەکانیان تەنها بە ئیسلام هاتووەتە دی.“ و، ئەم وتەیەش خۆی لە خۆیدا نرخشناسییە.

بەڵێ، خوای گەورە ژنی وەك هاوسەری پیاو دروست کردووە، نەك وەك هەر شتێکی تر. نەدەکرا ئادەم بێ حەوا و، حەوا بێ ئادەم بێت. ئەم یەکەمین جووتە، فەرمانبەرییەکی گرنگی وەك ئەرکی بوون بە ئاوێنە و تەرجومانی زمانی حاڵی بوونەوەرانی تریان نرابووە سەر شان.. دوو جەستە و یەك ڕۆح بوون، نوێنەرایەتیی دوو دیوی جیاوازی یەك حەقیقەتیان دەکرد. بە تێپەڕبوونی کات تێگەیشتنی چەوت و بۆچوونی لار و وێر و خۆسەپێنەر، ئەم یەکێتییەی شێواند. بەمەش هەم ڕێسای خێزان تێکچوو و هەم هێی کۆمەڵگا.

لەڕاستیدا وەکو ئیبن فارید دەڵێت، جوانیی ژن و جوانیی پیاویش، یەکی درەوشانەوەیەکی بەدیهێنەری خاوەن جوانیی ڕەهان. ئەگەر ئەم دوو شاکارەی بەدیهاتن پێگەی ڕاستەقینەی یەکتر قبووڵ بکەن و دەست بخەنە ناو دەستی یەکتر، دەگەن بە جوانییەك کە زۆر مەزنترە لەمەی ئێستایان. هەموو ئەو بۆچوون و پیاهەڵدانانەش کە دەکەونە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیەی کە بەدیهێنەر دیاری کردووە، لەڕاستیدا ناشرینیان دەکات.. بەتایبەت لە ڕووی جوانییەوە ئافرەت بە ئاوێنەیەکی فرەڕەهەندی خوای خاوەنی جوانیی دادەنرێت، بەڵام ئەگەر بە ڕەنگە مردووەکانی سروشتی مرۆیی خۆی مات بکات و، هەموو شتێك بە

جیسمانییەتەوە ببەستێتەوە، ئەوا بواری ئەرکی گرنگی ئاوێنەداریی تەسك دەکاتەوە و، دەبێت بە هۆکارێك بۆ فیتنە و، لەوانەیە ناوبرانیشی بە فیتنە لەم ڕووە تایبەتەیەوە سەرچاوەی گرتبێت.

بەڵێ، ئەگەر ژن هەست بە قووڵایی ناخی خۆی بکات و، تا ئەو کاتەی لە سنووری سروشتی خۆیدا بمێنێتەوە، دەبێت بە ئاوێنەیەکی هێندە درەوشاوە بۆ ڕەنگدانەوەی جوانییەکانی ناخی "بوون"، بەجۆرێك کاتێك ئەوانەی لە چوارچێوەی ڕێگەپێدراوی خۆیدا دروست تەماشای دەکەن و ڕاست بیردەکەنەوە، بە یەك تەکان لە تاریکییەکانی لاشە ڕزگاریان دەبێت و، بەرز دەبنەوە بۆ ئاسۆیەك کە تیایدا جوانییەکانی خوای گەورە دەبینن و، وا لە دڵیان دەکەن بڵێت:

"خۆری جوانیی ڕوخسار جوانان ئاخیرەت دەبێ ئاوا
من موحیببی لایەزالم (لا أُحِبُّ الآفِلِينَ )."

# سەرشێتیی "هێز"

لە دنیایەکدا دەژین کە ڕووناکی و تاریکی لەناو یەکدا و، نوور و چڵك لە تەنیشت یەك و، ئەخلاق و فەزیلەت لەگەڵ بێڕەوشتیدا دراوسێی یەك و، جوانییە بۆن خۆشەکان هاوسنووری ناشرینییەکان و، ئومێدیش یەك دوو هەنگاو لەولای نائومێدی و خەیاڵ شکانەوەیە.. بەڵێ، لە هیچ سەردەمێکی تردا بەوێنەی ئەم ڕۆژگارە، بە ئەندازەیەکی ترسناکی لەم شێوەیە و، بە شێوەیەکی هێندە فراوان و پلان بۆ دارێژراو، کاولکاریی سەرسووڕهێنەر و بنیاتنانی سەرسامکەر لە تەنیشت یەکەوە ڕوویان نەداوە. هەموو شتێك وەکو خێرایی هەورەبروسکە و بە ترسناکیی هەورەگرمە هێندە خێرا و لەناکاو دێت، ئەو کەسانەی پێچەوانەی یەکترن لە بیرکردنەوەدا، تەنانەت دەرفەتی دەربڕینی ئومێد یان نائومێدیی و، قبووڵکردن یان ڕەتکردنەوەیان بۆ ناڕەخسێت.

ئەوانەی نوێنەرایەتیی هێز و بازوو دەکەن، بە دانانی بەرهەمەکانی تەکنەلۆجیا لەژێر فەرمانی ڕق و، قین و، هەڵپەدا، دەتوانن ئەو کاولکاریی و ڕووخاندنەی کە جاران لە سەدەیەکدا ئەنجام دەدرا ئێستا لە ڕۆژێك یان

دوو ڕۆژدا جێی بکەنەوە و، بە جووڵەیەك پتەوترین سیستەمەکان تەختی زەوی بکەن و، لە چاو تروکاندنێکدا ڕژێمێك لاببەن و دانەیەکی دی لە جێگای دابنێن و، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بەهێزترین و ڕەگداکوتاوترین شێوازی بیرکردنەوە و پتەوترین بۆچوونەکان خاپوور بکەن و، خەڵکانێکی زۆر بێ پشت و پەنا بهێڵنەوە و، سنوور بۆ بیروباوەڕ دابنێن و ئازادیی بیرکردنەوە سنووردار بکەن و، بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا هێزی میدیاکانشیان خستە شوێن خۆیان و، لەم ڕێیەوە توانییان حەق بە ناحەق و ناحەقیش بە حەق پیشان بدەن و، بێسەروبەرەیی و بەربادیی بەهاکانیان لە تێکڕای کۆمەڵگادا هێنایە مەیدان.

لەوەتەی دنیا هەیە هیچ کاتێکی تر بە ئەندازەی ئەم ڕۆژگارە گاڵتەجاڕیی بە کەسایەتیی مرۆڤ و، کەرامەتی مرۆڤ و، دین و، نەتەوە و، خێزان و، ئەخلاق و، فەزیلەت و، چەمکە یاساییەکان نەکراوە و، هێندە بێویژدانانە ڕەخنەی نابەجێیان لێ نەگیراوە و، بە چەند بڕیارێکی بێمانا مەحکومی لەبیرچوونەوە و پشتگوێ خستن نەکراون.

سەرەڕای هەموو ئەم شتە ئەرێنییانە، بەڕای من زەقترین تایبەتمەندیی ئەم سەردەمەی کە هەزار و یەك شتی ناقۆڵای تێدا ڕوودەدات بریتییە لەوەی کە "حەق" کراوە بە قوربانی "هێز" و، بەرژەوەندی پێش هەموو بەهاکان کەوتووە و، ڕەگەزپەرستیی ڕەق و تەق جێگای سەرجەم بەها گەردوونییەکانی گرتووەتەوە و، کێشەی نێوان وڵاتان و میللەتان بە هێزی بازوو هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدرێت. گەرچی "هێز"یش بێگومان حیکمەتێك لە بوونیدا هەیە.. بەڵام ئەوە حەقیقەتە کە لەو کێشانەدا بە "هێز" هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدرێت، ژیری و، لۆجیك و، بیرکردنەوە و،

تەنانەت زیرەکیش هەڵناسەنگێنرێن، نەك هەر تەنها هەڵناسەنگێنرێن بەڵکو زۆربەی جاریش پشتگوێ دەخرێن. لەبەر ئەوە زۆرێك لەو شۆڕش و گۆڕانانەی کە بە یارمەتی بەکارهێنانی هێز لە دنیادا ڕوویان داوە، هەرچەندە دواتر چەندین ساڵ بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی کۆمەڵگا لەسەر ئاستی عەقڵیی و لۆجیکیی تەرخان کراوە، بەڵام دیسانیش نەتوانراوە سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت.

بەڵێ، ئەگەر "هێز" لە دەستی "حەق"دا بێت و، لۆجیك و بیرکردنەوە ڕابەرایەتیی بکەن، دەکرێت هەندێك جار هەندێك لە کێشەکان چارەسەر بکات، بەڵام هەمیشە "هێز" لە سایەی هەستەکان و بیرکردنەوەی وشك و ڕەقدا، بووە بە ئامێرێك بۆ کاولکاریی. بەڵێ، هەر ئەم سەرشێتییەی "هێز" بوو کە چاوی ئەسکەندەری بەر شەوارە خست و، زیرەکییەکەی ناپلیۆنی کون کون کرد و، هیتلەریشی کرد بە یەکەم شێتی سەردەمی خۆی. بەداخەوە ئەمڕۆش حەق و، لۆجیك و، بیرکردنەوە لە بەرامبەر ئەم هێزە سەرشێتەدا لە حاڵەتی دۆڕاندان و، ژیانی دیلێتیی بەسەر دەبەن.

وا هەست دەکەم لە پشتی زنجیرە قەیرانەکانی ئەم ڕۆژگارەوە و لە دوای سەرجەم ئەو کارەساتانەشەوە کە هەریەکەیان وەکو شەپۆلێکی مەرگ وان، دیسان هەمان ئەم "هێز"ە لە سنوور دەرچووە خۆی مەڵاس دابێت.. ئەم هێزە کتوکوێرەی کە جێگای بەها مرۆییەکان و، فیکرە مرۆییەکان و، بیرکردنەوەی لۆجیکیی و، ڕێزگرتن لە حەق و ڕاستی، گرتووەتەوە. هەتا ئەو کاتەش کە ئەوانەی نوێنەرایەتیی "هێز" دەکەن خۆیان ڕادەستی "حەق" دەکەن و، ئەو حەشاماتەش کە شوێنیان کەوتوون لە گەرداوی ترس و ئەندێشەی ژیانی ڕۆژانە ڕزگاریان دەبێت و،

"بەڕوونی" ئەو دنیایە دەبینن کە تیایدا دەژین، پێدەچێت ئەم قەیرانانە هەر بەردەوام بن.

ئەو بەجیهانیبوونەی کە وا دیارە لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا بە خۆی و پێداویستیی و یاساکانیەوە ئێمەش هەڵدەلوشێت، ئەگەر بێت و بێدار نەبینەوە و، نەیەینەوە هۆشی خۆمان و، نەبین بە یەکێك لەو لایەنە هاوسەنگانەی کە خاوەنی تەوەرەی حەق و، هێز و، ژیری و، لۆجیکە، ئەوا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژی تریش بە ناچاریی بە ژێردەستەیی و چاولێکەریی دەمێنینەوە.

بەڵێ، هەمیشە پێویستە چاومان -بە بەکارهێنانی دووربینی ڕابردوو- لەسەر ئاسۆ ڕەنگینەکانی ئایندە بێت. ئەگینا ئەم بەراوەژوویی و بەربادییە هەر ئاوا بەردەوام بێت، خوا نەخواستە کۆمەڵێك شەپۆلی قەیرانی مەزن و گۆڕانی پڕ لە ئاژاوە -بەجۆرێك ئەم گەرداوانەی ئێستا لەناویاندا گیرمان خواردووە لە چاویاندا یەکجار سووکەڵە دەردەکەون- گوژم دەخۆنەوە و، ڕاپێچمان دەکەن و، جارێکی تر هەستانەوە سەر پێ و ڕاستکردنەوەی پشتمان زۆر سەخت دەبێت. بۆ دەربازبوون لەم کەندەڵانانەی ڕێیان پێ گرتووین، پێویستمان بە کۆمەڵێك ڕۆحی خەمخۆر هەیە کە لەبەر خاتری خۆیان ناژین. بەڵێ، مرۆڤایەتیی لەم سەردەمەدا چەند قارەمانێك ڕزگاری دەکەن کە بیر لە خۆیان ناکەنەوە و لەپێناوی خۆیاندا ناژین.

بیرکردنەوە ڕووناکەکانی ئەم پاڵەوانانەی کە ڕەنگی خۆشەویستییان گرتووە، ئەو ڕۆژەی ڕۆحی زۆربەی زۆری خەڵکی دەگرنەوە، زریانی نێوان

چینەکانی مرۆڤ هێور دەبێتەوە و، حەسرەت و هیجرانەکان تەواو دەبن.. لە سایەی بەدەست هێنانەوەی جێگای تایبەتی خۆمان لە هاوسەنگیی نێوان وڵاتاندا، دەگەین بە نهێنییەکی هاوسەنگیی خوایی، کە پێکهاتووە لە دیسپلینێکی جددی و دادپەروەر و، پەیوەستی ئازادییەکە لە بواری بیرکردنەوە و دەربڕیندا کە سروشتیی و تەواوەتییە.. ئەو قەیرانانەی کە لەسەر ئاستی کۆمەڵگا و، ئەو کێشە هەرە گەورانەی نێوان نەتەوەکان کە ئێستا پێیانەوە گیرۆدەین، یەك لە دوای یەك چارەسەر دەبن.. جارێکی تر هاوسەنگیی ئەزەلیی نێوان خۆشی و خەم و، بەختەوەری و بەدبەختیی دادەمەزرێتەوە و، جارێکی تر چۆنێتیی بوون بە مرۆڤێکی سوودبەخشمان پێ نیشان دەدرێت.

هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئاسۆیەکی لەم شێوەیە سەرەتا بۆ نەتەوەی موسڵمان و پاشان بۆ هەموو مرۆڤایەتیی یەکجار گرنگە و، سەبارەت بە ئاشتیی جیهانیی و، پێکەوەژیانی نەتەوەکان و، ڕێسای جیهان و، بەها گەردوونییەکانیش دارای بایەخێکی مەزنە و، یەکێکە لە چاوەڕوانییەکانی مرۆڤایەتیش. هەموو جووڵەیەك بە ئاڕاستەی بەدیهێنانی ئەم شتەی کە چاوەڕوان دەکرێت و، هەموو جووڵەیەکیش بە ئامانجی بەرزکردنەوەی حەق، ڕاستترین و دروستترین هەنگاوە بەرەو خوای گەورە نرابێت. بەم ئاڕاستەیەدا هەموو هەنگاوێك، هەرچەندە بچووکیش بێت، پارچەیەکی پێکهاتە مەزنەکە پێکدەهێنێت لە داهاتوودا. بەڵێ، ئەم هەوڵ و کۆششە گوڕەیی و بچووکانە وەکو چەند دەزووڵە ئاوێکی کەم وان کە حەوزی ئایندەی پرشنگدار پڕدەکەن. ئێمەش بە خەون و خەیاڵی ئەو ڕۆژانەوە دەژین کە هێدی هێدی دەبێت بە گۆم و، لە دەمی ڕژان و شەپۆلدانیشیدا ڕێگا بۆ خۆی دەکاتەوە.

# شەماڵەکانی بەهەشت لە ژیاندا

هەرچەندە ژیان کۆمەڵێك نارەحەتیی تایبەت بە خۆی هەیە، بەڵام هەرگیز ئەو خراپەش نییە کە بانگەشەی بۆ دەکرێت. بەڵێ، لەوانەیە بەدرێژایی ژیان مرۆڤ جاروبار دووچاری ناخۆشی و هەندێك جاریش گرفتاری خەیاڵ شکان و نائومێدی ببێت. بەڵام تێکەڵاوبوون لەگەڵ "بوون"دا و، چاو کرانەوە بەڕووی چەندەها جوانیی جۆراوجۆردا و، ناسینی شتە جوانەکان و، ڕۆیشتن بەناو سەرسووڕهێنەرترین و سەرنجڕاکێشترینی شتاندا و، بۆنکردنی بۆنە هەرە خۆشەکان و، تامکردنی چێژە هەرە بەلەزەتەکان و، هەناسەدان و، پیاسەکردن بەناو دەشت و چیادا و، باوەڕهێنان و، هەبوونی هیوا و، ئامادەکردنی هەزار و یەك جوانیی تایبەت بە ئەودیو لێرە و، خۆئامادەکردن بۆ دەستکەوتنی هەزار و یەك جوانی ئەویَ.. بەڵێ، هەموو ئەم جوانییانە و هەر شتێکی جوانی تریش کە لە ڕێگەی هەستە مرۆییەکانمانەوە پێمان بگات، هەموویان بەهۆی ژیانەوە هەستیان پێ دەکرێت و، لە ڕێگەی ژیانەوە لێیان تێدەگەین و، بە یارمەتیی ژیان بەدەست دەهێنرێن.

لەڕاستیدا مردنیش لە زۆر ڕووەوە جوانە. مردن بۆ ئەو کەسانەی کە ژیانیان بە بیرکردنەوە و، باوەڕهێنان و، کارکردن بە باوەڕەکەیان بەسەربردووە، پاشەڕۆژێکی خۆشویستراو و شیرین و جوانە، بەڵام سەبارەت بەوانەی کە تەمەنیان لەناو زیندانی جەستەدا بەسەربردووە هەرگیز شتێکی خۆشویستراو و چاوەڕوانکراو نییە. بەڵکو بۆ ئەوان هەتا بڵێی تاڵ و بێتام و بێزارکەرە.

ژیان سەبارەت بە مرۆڤی باوەڕدار بە هەموو لایەنێکییەوە سەرچاوەی هەزار و یەك جوانییە و درەوشانەوەیەکی ڕەحمەتی ڕەهای بەدیهێنەری مەزنە. هەوڵی باشترکردن و ڕازاندنەوەی ئەم دنیایە دەدەین کە لە سایەی ژیاندا لەناویدا دەژین و پارچەیەکین لێی و، لە ڕەهەندێکی جیاوازی کاتدا کە بەهۆی ئیمان و ئومێدەوە بەدەستمان هێناوە، دەگەین بە چەندەها تام و چێژ کە لە سەروو توانای تەسەوور کردنەوەیە و، هەست دەکەین کە کارکردن بووە بە خودی لەزەت لە لامان.

ئەم کتێبی سروشتەی کە بە هەزار و یەك ڕەنگی ئاڵ و واڵا ڕازاوەتەوە، توانای تێگەیشتن و شعوورێك کە بتوانێت هەست بە سەرجەم جوانییە سەرسووڕهێنەرەکانی ناوی بکات و لێی تێبگات، دڵێك کە چاوی کرابێتەوە بەڕووی جوانییەکاندا، پاشان بەخشینی مافی ڕێکخستن وبەکارهێنانی بوونەوەران بە مرۆڤ کە نیشانەی خەلات کردنی ئیرادەیە بەم ئادەمیزادە و، ئنجا مرۆڤ خۆیشی ئاگاداری هەموو ئەم نیعمەتانە بێت.. بەڵێ، ئایا هەموو ئەمانە جوان نین..؟

ئەوەی ماوەتەوە لەسەر شانی مرۆڤ ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك بەدوای دەرگای ڕێسا و جوانییەکی جیاوازدا بگەڕێت و بیدۆزێتەوە و، هەوڵی کردنەوەی بدات و، توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ تەماشاکردنی نوێ و، پاشان تاریکییە دەیجورەکان لەدوای خۆی جێبهێڵێت و هەمیشە بەرەو ڕووناکییەکان هەنگاو بنێت.

# ژیان لە سایەی
# ئیسلامدا

# ژیان لە سایەی ئیسلامدا

ژیان لە سایەی ئیسلامدا بریتییە لە ژیان لەناو ناز و نیعمەتی لوتفە خواییەکاندا. ئەو کەسانەی نەیانتوانیوە بگەن بە بەختەوەریی ژیانێکی وابەستە بە قورئانەوە، مەحاڵە لە ئەفسوونی ژیان لە سایەی ئیسلامدا تێبگەن. ئیسلام، جۆرەکەی تەنها لە خۆیدا قەتیس ماوە و، ئەوانەش کە لەم چوارچێوەیەدا هەستی پێ دەکەن و لەناویدا دەژین، وەك ئەوەی لە هۆڵی چاوەڕوانیی بەهەشتدا بژین تەمەنیان بەسەر دەبەن و، لە هەموو چاو کردنەوە و داخستنێکدا زەردەخەنە بەسەر چواردەوریاندا دابەش دەکەن. سوپاسی خوا دەکەن لەسەر نیعمەتی ژیان لە سایەی ئیسلامدا، سوپاسگوزاریی دەردەبڕن کاتێك بە تێڕامانەوە لە دەوروبەری خۆیان دەڕوانن و لەبری هەوا ئیمان هەڵدەمژن، کاتێك لە هەموو شتێکی بینراو و بیستراودا قورئانیان بیردەکەوێتەوە، کاتێك بە چێژێکی قووڵەوە تەماشای بوونەوەر و ڕووداوەکان دەکەن و بەو تەفسیرانەی دەڕژێتە ناخیانەوە لە هۆشی خۆیان دەچن...

ئەوان لە سایەی ئەو ڕێکوپێکی و ڕێسایەی کە لە جیهانی ڕووناکی

قورئاندا بۆ ژیانی فیکریی خۆیان سازاندوویانە، هەمیشە ڕاستیی دەبینن و، بیر لە ڕاستیی دەکەنەوە و، ڕووداوەکان بە ڕاستیی لێك دەدەنەوە و، لەو شتانەدا کە تێیدەگەن هەست بە تام و لەزەتی تێگەیشتن دەکەن و، لەو حاڵەتانەشدا کە تێناگەن، لە سایەی ئەو متمانەیەی کە بە خوای گەورە هەیانە، هەموو شتێك بە حیکمەتێکەوە دەبەستنەوە و، هەرگیز دووچاری ناخۆشی و، قەیران و، سەرلێشێوان نایەن. بەڵکو بەپێچەوانەوە، بە شوکر و سوپاسگوزاریی، مانا و قووڵایی نوێ دەبەخشن بە حاڵەتە خۆش و بەتام و ڕەنگینەکان، دیوی دەرەوەی ئەو ڕووداوانەش کە بە ڕواڵەت ناشرین دیارن و پێیان دەوترێت "بەڵا و موسیبەتەکان"، ئەوان بە وتنی "ئەمەش دەڕوات" نەرمی دەکەنەوە و، تەنانەت لە تاریکترینی ئەو قەیرانانەدا کە خەڵکی پێیانەوە دەتلێنەوە، چەند بەرگێك دەدوورن کە نەخشی شەوق و شوکری لەسەر چنراوە و، ئەو ڕێبوارانەش کە بە کۆڵانی ئەواندا تێپەڕ دەبن هەست بە شیرینیی و تەڕ و پاراویی بەهەشتییەکان دەکەن.

بە ئەندازەی تێکەڵاوبوونمان لەگەڵ قورئاندا و، هێندەی هەوڵدانمان بۆ جێبەجێ کردنی ئیسلام -بە ڕەنگ و شێوە و قووڵییە تایبەتییەکەی خۆی- لە خۆماندا، هەر هەمووومان هەست دەکەین کە ژیانمان بەهۆی ئەوەوە بەرزبووەتەوە و قووڵ بووە و، جیاوازتر بووە و ڕەنگی دوارۆژی وەرگرتووە و، لە سایەی ئەودا لە ئامانجی بوون و، حیکمەتی بەدیهاتن و، نهێنیی و مانای مرۆڤ بوون و، ئامانجی نێررانمان بۆ سەر زەوی و، نرخ و بایەخی ئەو شوێنەی بۆی دەچین، تێدەگەین.. بە پلیکانەیەکی نوورانیی کە سەرێکی لەناو دڵماندایە، دەگەین بە ئاسۆیەك کە تیایدا فانییەکان لە خوای "باقی"ییەوە زۆر نزیکن و، بە خۆمان دەڵێین "تومەز

ئەمەیە ژیانی ڕاستەقینە." و، لە هەمبەر سیمای پڕ لە خەندەی بەختماندا لە هۆشی خۆمان دەچین.

ئێمە، لە بەرامبەر ئەوەدا کە هەموو کەسێك لە ئاست ترسناکیی و مەترسیی "بوون" و، بەدیهاتووان و، ڕووداوەکاندا ژیانێکی لێوانلێو لە تەنیایی و نامۆیی بەسەر دەبەن، لە سایەی هەرێمی ڕۆشنی ئیسلامدا، بە تەواوی گوێڕایەڵیی و ملکەچییەوە بۆ خوای گەورە، گونجان و جوانیی نێوان ئەو جووڵە گشتییانە دەبینین کە لە گەردووندا دەست بەکارن و، لێیان حاڵی دەبین و، ئەم دنیا گەورەیە بە خانە و لانەی خۆمان دەزانین و، هەست بە دۆستایەتیی و نزیکیی دەکەین لەگەڵ هەموو تەنێکدا و، لەگەڵ هەموو شتێکدا جۆرێك لە ئاڵوگۆڕی خۆشەویستیمان بۆ دروست دەبێت و، لەسەر ئەوەی خوای گەورە ئەم بەختەوەرییە نەبڕاوەیەشی پێ بەخشیوین، پڕ بە دڵ و هەناومان سوپاسی پێشکەش دەکەین.

لە سایەی ئەو نوورەی کە قورئان بەخشیویەتی بە چاو و دڵمان، هەموو شتێك، جیاوازتر و، ماناداررتر و، دەوڵەمەندتر و، کاکڵەدارتر دەبینین وەك لەو وێنە ڕووکەشەی کە عەقڵی ڕواڵەت بین پێمان دەدات و، وەك ئەوەی لە هەمان ئەم "شوێن"ە سێ ڕەهەندییەدا، لە جیهانێکی سەروو دووری و ڕەهەندەکاندا بژین، خۆمان لە تەماشا کردنی دنیایەکی ئەفسووناویدا دەبینینەوە. تەماشا کردنێکی لەم جۆرە لەوانەیە بۆ هەموو کەسێك بە هەمان ئاست مەیسەر نەبێت، وەلێ بە ئەندازەیەکی دیاریکراو هەر هەمووومان، بەو دەوڵەمەندییەی کە ئیمان لە دڵماندا سەوزی کردووە و، بەو ڕووناکییەی کە قورئان لە دنیای بیرکردنەوەمانی هاویشتووە، ئەم دنیایەی کە خەڵکانی تر خەفە دەبن و دەخنکێن تیایدا و زۆر جاریش

لەم قەیران بۆ ئەوی تر ڕاپێچ دەبن، ئێمە زۆر فراوانتر لە فراوانیی ڕواڵەتیی خۆی، دەردەکەوێت لە پێش چاوماندا و، لە کاتێکدا کەسانی تر وا گومان دەبەن کە هەمیشە لە زینداندان و کەلەپچە لە دەست و قاچیان توند کراوە، ئێمە وەکو میوانی ڕێزلێگیراوی کۆشك و سەرا بێسنوورەکان، هەست بە گەرموگوڕیی و نەرمونیانیی "پێشوازیی" دەکەین.

لەڕاستیدا، لە ڕوانگەی هەرێمی فیکریی ئیسلامەوە، ئەم دنیا فراوانەی کە تام و چێژی لێ وەردەگرین، وەکو پەردەیەکی ڕەنگاوڕەنگ وایە کە بەسەر دواڕۆژدا -ئەو دواڕۆژەی کە پێشانگای ڕاستەقینەی جوانییەکانە- دادراوەتەوە و، تەنها یەکێکە لە ڕەهەندە زۆر و زەبەندەکانی ئەودیو.. بەڵێ، لە دیدگای ئیسلامدا گشت جیهانە ماددییەکان سەرەڕای ڕازاوەیی و شان و شکۆیان، لەچاو جیهانە ناماددیەکاندا وەکو جەستە وان لەچاو ڕۆحدا و، چەشنی ماڵ و گوندەکەمان وان لەچاو جیهاندا. لەم جیهانبینییەدا هەموو شتێك لە جیهانێکی تردا دەست پێدەکات و، دوای ئەم جیهانەش، ڕەنگ و شێوە و شکڵ دەگۆڕێت و بەردەوام دەبێت.. وە لە ڕوانگەی هەمان ئەم جیهانبینییەوە ئەم دنیا گەورە و فراوانە تەنها مەنزڵێکە و، نیعمەتەکانی ناویشی تەنها بۆ بزوواندنی ئیشتها و لە شێوەی "نانی بەیانی"دان. بەرزەخیش ئەو وێستگەیە یان ئەو بەندەرەیە کە هەموو کەسێك لێیەوە و لەودیوی شووشەیەکی لێڵەوە تەماشای پاشەڕۆژی خۆی دەکات.. مەحشەریش گوزەرگایەکی ترسناکە و -هەرچەندە شەماڵی هیوا و ڕەحمەتیش تیایدا هەڵدەکات- تیایدا دڵەکان دەکەونە لەرزین و، ئەژنۆکان دەشکێن، ئێرە بەدواوەش، یان باخچە فیردەوسییەکانە کە هەمیشە لە نوێ بوونەوە و ڕەنگینیدان،

یاخود چاڵێکی پڕ لە گەرداوە و هەموو چرکەیەك شەپۆلێکی ترسناك تیایدا قوڵپ دەدات.. جیهانی ئەودیو کە بە کۆتایی هاتنی ئەم دنیایە دەست پێ دەکات بریتییە لە کۆتا وێستگەی ئەم گەشتە دوور و درێژە، فەرموودەی پیرۆز بەم شێوەیە باس لە نەزانراویی و نادیارییەکەی دەکات "نە چاو بینیویەتی و، نە گوێ بیستوویەتی و، نە بە خەیاڵی کەسیشدا هاتووە..." ئەوێ بریتییە لە خێوەتی بەختەوەریی ئیمانداران.

لە جیهانبینیی ئیسلامدا هەروەك دنیا هەموو شتێك نییە، بە هەمان جۆر مردنیش کۆتایی نییە، بەڵکو بریتییە لە حەوانەوەیەکی کاتیی یاخود بینینی پاشەڕۆژ لە نزیکەوە. گۆڕیش بریتییە لە خانێکی سەرەڕێ -کە لێیەوە چەندین ڕێگای دوور و درێژ دەست پێدەکات بۆ چەندین شوێنی جیاواز- بۆ گەشتیارانی بێگانە و، ڕێڕەوێکی داخراوی وایە کە تیایدا پاشەڕۆژی ڕەها بە ئومێد و ترسەکانیەوە بە تەواوەتیی هەستی پێ دەکرێت.. بەڵێ، لەکاتێکدا گۆڕ وێستگەیەکی دڵخۆشکەر و کراوەیە بەڕووی هیواکاندا بۆ هەندێك، کەچی سەبارەت بە هەندێکی تر بەندیخانەیەکە بۆ هاوڕێیەتی کردن لەگەڵ مار و دوپشکدا. گۆڕانی ئەوێ بە کۆشك و تەلار یان بە زیندانێك، پەیوەندییەکی نزیکی بە هەست و بیرکردنەوە و ڕەفتارەکانی ئێرەمانەوە هەیە. هەوڵ و کۆشش و دامەزراویی ئێرە، لەوێ میوەی بەختەوەریی دەگرێت.. دەکرێت هەموو ئەم تێبینییانە بە وتەی "دنیا کێڵگەی دواڕۆژە" کورت بکەینەوە.

موسڵمانێك کە خاوەنی تێگەیشتنێکی قووڵ و فراوانی لەم جۆرەیە، ئەگەر هەموو ساتێکیش لەناو خەڵکانی تردا بژی، وەلێ هەموو شتەکان جیاواز دەبینێت و، جیاواز هەستیان پێ دەکات و، جیاواز لێکیان دەداتەوە

و، گشت لایەن و هەڵسوکەوتەکانی هەردەم جیاوازیی ئەو دەردەخەن. پێش لە هەر شتێکی تر ئەو بەم ئاسۆیەی کە هەیەتی جێنشینی خوای گەورەیە لەسەر زەوی. دەشزانێت کە مافی بەکارهێنان و ڕێکخستنی دراوەتێ لە هەموو دنیا و شتانی ناویدا. ئەو، هەمیشە سەدای:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾

(البقرة: ٣٠)[١]

لە ویژدانیدا دەبیستێت و، لە بەرامبەر ئاوڕلێدانەوە(توجه)ی خواییدا:

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾

(الجاثیە: ١٣)[٢]

لارەمل دەوەستێت و، ئەم ئاوڕلێدانەوە و ڕێزلێنانە سەرسووڕهێنەرەی

---

١. واتە: بیریان بێنەوە کاتێك کەپەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی وت بەڕاستی من جێ نشینێك دروست دەکەم لەسەر زەوی فریشتەکان وتیان "ئایا کەسێکی وای تیا دروست دەکەیت کە خراپەو بەدیی تێدا بکات وە خوێنی تیا بڕێژێ؟ لە کاتێکدا کە ئێمە یادت دەکەین بەستایش کردنت وە بەپاك ڕات دەگرین" (خوا) فەرموی "بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن".

٢. واتە: ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکاندایە، لە خۆر و مانگ و ئەستێرە و هەواو تیشك(أشعة) جۆراوجۆرەکان و گەلێك شتی تر، هەروەها هەموو ئەوەیش کە لە زەویدا هەیە، لە دەریا و ڕووبار و کانی و دار و درەخت و شینایی و کان و سەرچاوەکان و مالآت و گیانلەبەرانی جۆراوجۆر،... هەر هەمووی هی ئەون و لەوەوەن و ئەو بۆی ڕەخساندوون تا سوودیان لێ وەربگرن... بێگومان هەر یەکە لەوانە بەڵگە و شایەتن بۆ ئەو کەسانەی کە تێدەفکرن، لەسەر بوون و گەورەیی و توانای بێ سنووری خوا و تاك و تەنهایی خوای بەدیهێنەریان بۆ دەردەکەوێت.

کە لە قووڵایی سەروو "کات"ەوە دێت، وەك ئەوەی بۆ یەکەم جار بیستبێتی و، بۆ یەکەم جار بەدەستی هێنابێت خۆشحاڵ دەبێت و، هەموو ئەو نیعمەتانەی کە تا ئێستا پێی بەخشراون بە گەرەنتی نیعمەتەکانی ئایندە دەزانێت و، بە هەڵەداوان و هەناسەبڕکێ بە ڕێی پێغەمبەراندا بەردەوام دەبێت. بەم ڕێگایەدا دەڕوات و هەرگیزیش لە پشت بەستن بە خوای گەورە و هەبوونی متمانە پێی، درێغی ناکات. دەست گرتن بە هۆکارەکانیشەوە بە فەرمانێکی خوایی دەزانێت سەبارەت بەوانەی کە لە بازنەی هۆکارەکاندا دەژین. لەبەر ئەوە چاوەڕێی ئەنجام و بەرهەمی هەوڵ و کۆششەکانی تەنها و تەنها لە خوای گەورە دەکات. ئەو، چونکە ژیانی پەیوەستە بە تێگەیشتنێکی هاوسەنگی لەم جۆرەوە، هەمیشە هەست بە پاراستنی خوایی دەکات و، ئارامی و، دڵنیایی و، ئاسایش لەگەڵ هەناسەکانیدا هەڵدەمژێت. ئای چەند خۆشە ئەو دڵ ئارامییەی کە لە تەسەووڕێکی لەم شێوەیەوە لەدایك دەبێت.! چەند ناسکە ئەو خۆشی و نەشوەیەی کە ئەم ئاسۆیە دەیبەخشێت بە هەستەکان.! وە چەند کۆڵەکەیەکی پتەوە ئەو هێزەی کە لە پشت بەستن و متمانەبوون بە خوای گەورەدایە!

دەتوانین زۆر بە ئاسانی ئەوە بڵێین کە لەناوبردنی خراپە -ئەگەر بە ڕێژەیەکی دیاریکراویش بێت- لەسەر زەویدا و، دامەزراندنی ئاشتی و پێکەوەژیانێکی جێگیر لە نێوان نەتەوەکاندا و، گەڕاندنەوەی ئەو بەختەوەری و ئاسوودەییەی کە لەمێژە مرۆڤایەتیی ونی کردووە و، سەرلەنوێ دۆزینەوەی گونجان و هاوسەنگیی لە نێوان ژیانی مرۆڤ لە لایەك و گەردوون و سروشت لە لایەکی تر و، و پاشان ڕەنگدانەوەی

ئەمە لە شێوازی ژیانی نەتەوە و کۆمەڵگەکاندا.. بەڵێ، هەموو ئەمانە تەنها لەژێر سایەی ئەو ئیسلامەدا دەگونجێت کە ناونیشانێکی تری ڕووتێکردنی دڵەکانە بۆ خوای گەورە. ئەگەر ئەمڕۆ نەتوانین هەموو ئەو شتانە ببینین کە ئیسلام پەیمانی داوە، ئەمە لە کەموکورتیی ئەوەوە نییە، بەڵکو پێویستە لە بێوەفایی و تەمبەڵیی دۆستان و شوێنکەوتووانیدا و، لە قین و ڕق و نەفرەت و بڕیاری لەپێشینەی دوژمنانیدا، بەدوای هۆکارەکەیدا بگەڕێین. چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾

(الاسراء: ٨٢)[١]

بیرمان دەهێنێتەوە کە ئەو دەرمانی هەموو دەردەکانە و، چارەسەری گشت کێشەکانە و، داوامان لێ دەکات ڕووی تێ بکەین و، بە فەرمانی:

﴿ إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾

(الإسراء: ٩)[٢]

کلیلێکی پڕ نهێنیمان دەداتێ کە هەموو دەرگایەك دەکاتەوە و، هەموو کێشەیەك چارە دەکات. بەڵام بەداخەوە هێشتا زۆربەمان بە دەست

---

١. واتە: ئێمە لە ئایەتی قورئان، ئایەتی وا نازڵ دەکەین، کە شیفایە و ڕزگاریە لە نەخۆشی ماددی و مەعنەوی بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هەیە، بەڵام قورئان هیچ بۆ ستەمکاران زیاد ناکات زیان نەبێت.

٢. بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەك کە ڕاسترینە و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بە ڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

نەزانیی و پشت هەڵکردنێکەوە گیرۆدەین کە تێگەیشتن لێی مەحاڵە و، ناتوانین سوودی تەواو لەم کلیلە وەربگرین کە نرخی هەزاران گەنجینەی هەیە. ئەوەی جێی سەرسوورِمانە ئەوەیە کاتێك لە ژیانی رِۆژانەماندا ئامێرێك یان کەرەستەیەك خراپ دەبێت، پرسیار لە کارگە دروستکارەکەی یان شارەزایانی ئەو بوارە دەکەین، کەچی لەبەر هەر هۆکارێك بێت کاتێك باس دێتە سەر بابەتی کێشەکانی ژیانی دڵ و رِۆحمان، خۆمان نادەین لە قەرەی ئەم شێوازە لە چارەسەر کردن و، بیر لە فەرمان و ئامۆژگارییەکانی بەدیهێنەر ناکەینەوە. لە کاتێکدا بەپێی دەستووری "دروستکار دەیزانێت و بەرهەم هێن چاکی دەکاتەوە"، ئەم ئادەمیزادەی کە چەندێك بەنرخە ئەوەندەش ئاڵۆزە، دەبوو لە سەرجەم کێشە دیار و نادیارەکانیدا سەردانی ئەو زاتەی بکردایە کە خۆی وەك (العليم) و(الخبير) ناساندووە. ئەم کارە هەروەك رِێگای ژیری و لۆجیکە، بە هەمان جۆر گەرەنتیی هەڵەنەکردنە لە هەڵسوکەوتەکانیشماندا بە گشتیی. خوای گەورە لە بابەتی تیمارکردنی نەخۆشییەکانی دڵ و رِۆحماندا هەمیشە قورئانمان وەك سەرچاوەیەك پیشان دەدات و، ژیانی ئیسلامییانەمان یاد دەخاتەوە.

﴿وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ * أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾

(الملك: ١٣ - ١٤)[١]

١. واتە: قسەو ووتەکانتان بە نهێنی بکەن و بیشارنەوە، یاخود بە ئاشکرا بیانکەن، خوا هەر پێیان دەزانێت، چونکە بەراستی خوا ئەوپەڕی زانا و ئاگادارە بەوەی لە ناخی دڵاندایە و ئاگای لە کشت نیاز و خەیاڵێکە کە بەناو دڵدا تێدەپەڕێت و هیچی لێ ناشاررێتەوە. * ئەو خوایەی کە عالەمی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و درووستی کردووە، ئایا نازانێت چی لەناو دڵتاندا دەشارنەوە و چیش ئاشکرا دەکەن؟ لە حاڵێکدا ئەو خوایەکە زانینی دەوری هەموو شتێکی داوە، هەرچەندە ئەو شتانە زۆر وورد و شاراوە و پەنهانیش بن.

بایەخ پێ نەدانی زۆربەی مرۆڤایەتیی بە ئیسلام لەم ڕۆژگارەدا و، خۆ کەڕکردنیان لە قورئان، لە داهاتوودا وەکو بەدبەختییەکی مێژوویی تۆمار دەکرێت. پێم وایە نەوەکانی داهاتوو کاتێك ئەم بابەتە تاوتوێ دەکەن بە داخ و خەفەت و پەشیمانییەکی زۆرەوە دەڵێن "خۆزگە کەمێك خاوەنی بەسیرەت بوونایە.!" بەڵام ئەو ڕۆژە پەشیمانی و حەسرەت هیچ دادێك نادات..! گرنگ ئەوەیە ئەمڕۆ پەی بەو ڕاستییە مەزنە ببرێت و ڕێڕەوی مێژوو بگۆڕرێت. بزانین داخۆ نەوەکانی ئەمڕۆ دەتوانن لەم کارەدا سەرکەوتوو بن؟ خۆزگە سەردەکەوتن..!

ڕووکردنە ئەو ڕۆح و مانایەی کە ئیسلام و قورئان بانگی بۆ دەکەن لە لایەن نەوەکانی ئەمڕۆوە بۆ دوایین جار، دەبێت بە سەرلەنوێ لەدایك بوونەوە سەبارەت بە ئەوان. بەڵێ، قورئان کە کتێبی ئیسلامە، تاقانە سەرچاوەی ئەو یاسا و دەستوورانەیە کە هەرگیز کۆن نابن و، ئەو بناغانەیە کە قەت تەڕ و تازەییان ون ناکەن و، کانگای ئەسڵیترین بۆچوونەکانە دەربارەی بوون و، گەردوون و، ژیان و، بەها مرۆییەکان. باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی ئاسۆی نوێ بەرووی کۆمەڵگاکانی ئەم ڕۆژگارەشدا دەکاتەوە و، سیستەمی بیرکردنەوەی جیاوازیان پێشکەش دەکات و، ئازار و ناڕەحەتییەکانی مرۆڤی ئێمەش کەم دەکاتەوە. ئەوەندە هەیە جارێکی تر چاو بە پایە و پێگەی خۆماندا بخشێنینەوە لە بووندا و، توانا و لێهاتن و بەهرەکان لە شوێنی تەندروستی خۆیاندا بەکاربهێنین. لە ڕاستیدا ئەم "زیندووبوونەوە لەدوای مەرگ"ەی ئێمە لە پاش خەوێکی قووڵی چەند سەدەیی، ڕەنگی دنیاش دەگۆڕێت.

ئەوەش ڕاستییەکە کە هەموو زیندووبوونەوەکانی جیهانی ئیسلامیی لە مێژوودا ئەو کاتانەبوون کە لە لایەك بیروباوەڕی ئایینیی لەگەڵ یاسا گشتییەکانی ژیان و، نهێنییەکانی بوون و، سروشتدا هەڵشێلراوە و، لە لایەکی تریشەوە ئەو دژایەتییانەی تێپەڕاندووە کە بە زۆر خراونەتە نێوان فەرمانە تەشریعی و تەکوینییەکانەوە و، لەپاڵ ئاییندا کراوە بووە بەڕووی بوونەوەر و ڕووداوەکانیشدا. ڕۆژگارەکانی دواکەوتن و ڕووخانیشی ئەو کاتانە بوون کە ئەم گونجان و هاوسەنگییەی دانەمەزراندووە یان نەیتوانیوە بەردەوامیی پێ بدات. جیهانی ئیسلامیی ئەمڕۆش بە ڕێژەیەکی زۆر لەبەرئەوەی لە پەیوەندییی نێوان مرۆڤ و گەردوون و خوای گەورە تێنەگەیشتووە و نەیتوانیوە پارێزگاریی لەم هاوسەنگییە بکات، لەناو ئازاردا دەتلێتەوە و، یەك لە دوای یەك دووچاری سەرسامیی دەبێت و، لەم قەیران بۆ ئەو قەیران تلێر دەبێتەوە. ڕێگای ڕزگاربوونیش لەم سەرسامیی و قەیرانانەی تێی کەوتووە بریتییە لەوەی جارێکی تر بیری ئیسلامیی لەژێر ڕۆشنایی زانستە نوێیەکانی سەردەمدا بەگەڕبخات و، هەوڵی تێگەیشتن بدات لەو (سنة الله)یەی کە هەموو سووچ و قوژبنێکی ئەم جیهانەی گرتووەتەوە و، سەرلەنوێ لە ڕێگەی فەرمانە تەشریعییەکانەوە ئەو گونجان و هاوسەنگییە بەدەست بهێنێت کە لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و بەدیهێنەردا هەیە. لە ڕابردووی نزیکدا بە تەواوەتی لەم پەیوەندییە حاڵی نەبووین و، پەی بە گونجانی نێوان فەرمانە تەشریعیی و تەکوینییەکان نەبراوە و، تەنانەت بە نەبوو لە قەڵەم دراوە. تا وای لێ هات سەرلەبەری ڕێکوپێکیی ژیان تێکچوو و،

سەرجەمی شتان حاڵەتێکی هێندە پڕ لە کێشەیان وەرگرت کە سەر لێی دەرناچێت..

بەڵێ، ئێمە پەیوەندیی و هەماهەنگیی نێوان خۆمان و بوونەوەرانمان تێکداوە و، خوای گەورەش ئەو نیعمەتانەی لێ سەندینەوە کە پێشتر پێی بەخشیبووین، هەموو مەسەلەکە ئەمەیە. ئەمەش یاسایەکی نەگۆڕی خواییە.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾

(الأنفال: ٥٣)[١]

ئەگەر پێگەی ڕاستەقینەی خۆمان لە بەرامبەر خوای گەورە و گەردووندا بپارێزین و، نەیگۆڕین، ئەمە باشترین و سەلامەتترین ڕێگای پارێزرانمانە. ئەم کارە گرنگەش هەتا ئێستا تەنها نەوەی ڕاستەقینەی قورئان توانیویەتی تیایدا سەرکەوتوو بێت..

١. واتە: خوا هەر نیعمەتێکی بەهەر کەل و نەتەوەیەك بەخشی بێت، لێیان ناسێنێتەوە و لێیان ناگۆڕێت، تا خۆیان بەهۆی خراپیی خۆیانەوە ئەو نیعمەتە لەسەر خۆیان لانەبەن، یاخود نەیگۆڕن.. بێگومان خوا زۆر بیسەر و زانایە و ئاگای لە هەموو قسەیەکە و بە کردەوەی هەموو کەسێکیش ئاگادار و زانایە.

# مانگێکی تابان

# سەرەپای دنیایەکی

# تاریک

# مانگێکی تابان سەرەڕای دنیایەکی تاریک

قەیران و کێشەی یەك لەناو یەك لە دنیادا ڕوودەدات. مرۆڤایەتی نائاسوودەیە و دەستلەملانی ناخۆشییەکانە. هیچ کەسێك بۆچوونێکی باش و ئەرێنیی لەسەر سبەینێ نییە. ڕووداوەکان لێڵ و، هەمووان تووڕە و، هیواکانیش ڕەش و تاریکن. ستەمکار بە ستەمەکەی سیمای دنیا ناشرین دەکات، ستەملێکراوی هەژار بە نائومێدییەوە دەتلێتەوە، هیچ هەواڵێك نییە لەو فریاگوزارانەوە کە بڕیارە بێن بە هانای لێقەوماوانەوە، ئەوانەش کە هاواری ''فریامان بکەون!'' دەکەن دیار نییە داوای چی دەکەن. چەندین دەستی خوێناوی و ڕوخساری چڵکن، چەندین کەسی تریش کە بەرامبەر مرۆڤەکان بێبەزەیین و، بێڕوو و بێشەرمن لە هەمبەر خوادا.. وە چەندین شتی خراپی تریش... ئێمە لە کاتێکدا ئەمانە لە بەردەم خۆمانەوە دەڵێین، جارێکی تر ڕەمەزان وەك مانگێکی چواردەی بێدەنگ لە ئاسۆوە خۆی بۆ هاتن ئامادە دەکات. هەر لە ئێستاوە بە ڕووناکییەکەی ئاسۆمان ڕۆشن دەکاتەوە و ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتییش بێت دڵمان خۆش دەکات.

مرۆڤەکان بیرکردنەوە و هەستەکانیان چەندیش پیس ببێت، بەڵام بێگومان ڕەمەزان هەرچۆنێکی کردووە بە خۆی و نوورە ئەفسووناوییەکەیەوە قومێك ڕووناکی پێشکەشی ئەوان دەکات و، سینەیان دەشواتەوە لە تەم و ژەنگەکان.. ڕەمەزان زۆرێك لە خەڵکی بەگوێرەی پلەی توانا و لێهاتنیان ڕووناك دەکاتەوە و وەك خۆییان لێ دەکات. دەیسڕێتەوە دوکەڵ و غوبار لە ئاسۆماندا. بە تام و نەشوەی ئاخیرەتییەوە دەڕژێتەوە دڵمانەوە. وەك یارییە ئاگرینەکان دەبێت بە ڕۆشنایی و دەبارێت بەسەرماندا، هەنسکەکانمان هێور دەکاتەوە و، بیرکردنەوە ڕەق و توند و زبرەکان نەرم دەکات.

ئەو بەنزیکەیی لە هەموو هاتنێکیدا وەك ئارامی و ئاسوودەییەك کە لە ئاسمانەوە داببارێت، بە ڕەنگ و شێوە و سەرنجڕاکێشییە ئاسمانییەکەی دادەبەزێت بۆ ناومان و، ئەفسوونەکەی دەدات بە گوێی ڕۆحماندا. ئەو، هەرکاتێك وەك میوانێکی یەك مانگیی دێت بۆ لامان، ئێمە لە هەموو هاتنێکیدا ئەوەندە ئەفسووناویی دەیبینین، هەمیشە وەك یەکەم هاتنی بە تازەیی دەمێنێتەوە و، کاتێکیش دەڕوات هیجران و حەسرەت لە ناخماندا لە دوای خۆی بەجێدەهێڵێت.. بەدرێژایی ساڵێك چاوەڕێی ئەو ڕۆژانە دەکەین کە دەگەڕێتەوە بۆ لامان. زۆر جار بەرامبەر بە ڕۆژوو و، بەربانگ و، پارشێو و، تەراویحەکەی تووشی لەگەڵ ڕاهاتن و ئولفەت دەبین و، لەم ڕووەوە لە هاتنیدا هەست بە سەرسووڕمان و لە ڕۆیشتنیدا هەست بە سەرسامیی ناکرێت. بەڵام ئەو لایەنێکی هێندە ئاسمانیی هەیە کە تەنها ویژدانەکان دەتوانن بیناسنەوە و هەستی پێ بکەن، ئەوە ئەم لایەنەیەتی کە نەفسەکانمان پاکژ دەکاتەوە و، ڕوونیی

دەبەخشێت بە دڵمان و، هەستەکانمان دەمەزەرد دەکاتەوە و، لە هەموو هاتنێکیدا بە شێوەیەکی تەواو نوێ و جیاواز چەندین شتمان بۆ باس دەکات. لەم ڕووەوە ئەو هەرگیز ناژاکێت و، ڕەنگی کاڵ نابێتەوە و، مات نابێت و، میواندارەکانی لێی بێزار نابن، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە وەك بەهارێکی بەناز دێت و خۆی دەڕازێنێتەوە، پاشان هەستێکی پاییزانە لە ناخماندا جێدەهێڵێت و کۆچ دەکات.

بەڵێ، ئەو هەموو ساڵێك وەك نهێنیی و جادوویەکی ئاسمانەکان دێت و دەڕژێت بەسەرماندا، بە جۆرێکی زۆر جیاوازتر و قووڵتر خۆی دەنوێنێت. ئێمەش لە هەموو جارێکیدا جیاوازتر و ئەفسووناویتر دەیبینین و تا پلەی عاشق بوون وابەستەی دەبین. لەڕاستیدا ئەو لەم ڕۆژ بۆ ئەو ڕۆژ و لەم مانگ بۆ ئەو مانگ باز دەدات و، هەردەم جیاوازیی خۆی دەردەخات و، بە هەوا و ڕەنگ و شێوەی وەرزەکان خۆی دەڕازێنێتەوە. جاری وایە ڕەمەزان گەرمییە ئاسمانییەکەی ڕۆدەکاتە ناو سینەی بەفر و بارانی وەرزی زستانەوە، جاری واش هەیە یەکانگیر دەبێت لەگەڵ گەرمای ڕۆژانی هاویندا و، ئەوەمان بیردەخاتەوە کە پێویستە مافی هێزی ئیرادەمان بدەین و، لە ڕوویەکەوە عەزم و تێکۆشانمان دەمەزەرد دەکاتەوە و، ژیانی دڵ و ڕۆح نیشانی ئاسۆکانمان دەدات. جاری وایە چەشنی شەونم لەسەر گوڵانی بەهار دەنیشێتەوە و، هۆنراوەکانی ژیانەوە و زیندووبوونەوەمان بۆ دەچرێت، جاری واشە بە نەشوە ئاسمانییەکەی ڕەقیی و تاریکیی خەزان کوناودەر دەکات و، لە تەسکیی دنیاوە بەرەو هەرێمی گوشاد و فراوانی ئاخیرەتمان دەبات.

ئێمە وەکو کاهینەکان و لە ڕێگەی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر و مانگەوە

دەزانین ئەو کەی دێت، بەڵام ئەو لە هەموو هاتنێك و میوانییەکیدا چەندین شتی چاوەڕواننەکراومان خەڵات دەکات، سەرلەبەری ژیانمان دەگۆڕێت و، دەست دەخاتە ناو خواردن و خواردنەوە و، نووستن و هەستانمان و، بە ئەندازەی توانا و لێهاتنەکانمان دەمانچوێنێت بە ڕۆحانییەکان و، لە سەرجەم ئەم کارانەدا کە پێیان هەڵدەستێت دەنگی وەفای ئەودیو ئاسمانەکان دەگەیەنێت بە دڵەکانمان.

هەموو ساڵێك لەگەڵ هاتنی ڕەمەزان وەك ئەوە وایە ئاسمانەکان داببەزنە سەر زەوی. ڕووناکیی کۆڵان و شەقامەکان، گڵۆپی منارەکان، ڕۆشنایی نووسراوی نێوان منارەکان[١]، ئەو یارییە ئاگرینانەی لێرە و لەوێ هەڵدەبن و دەکوژێنەوە، هەموو ئەمانە ئەستێرە و کلکدارەکانی ئاسمانمان یاد دەخەنەوە. لە هەمان کاتدا حاڵەتی قووڵی ئیماندارانی ناو مزگەوتەکان کە هەتا بکرێت ناسك بوونەتەوە و، بە ئەندازەی ناسك بوونەوەشیان پاکژ بوونەتەوە و، مانەندی فریشتەکانی ئاسمان لە گوناه دوور کەوتوونەتەوە، ئەمانە هەستێکمان بۆ دروست دەکەن وەك بڵێی لەناو ڕۆحانییەکاندا دەژین. بەشێوەیەك موسڵمانێکی کراوە بەڕووی ئاسۆکانی دڵ و ڕۆحدا، لە هەر پارشێوێکدا شادییەکی جیاواز هەست پێ دەکات، لە هەر بەربانگێکدا بە جۆش و خرۆشەوە قوڵپ دەدات، هەر تەراویحێك بە چێژێکی ڕۆحیی جیاوازەوە ئەدا دەکات، بەو شتانەدا کە دەیبینێت و دەیبیستێت وا دەزانێت لە جیهانی خەونەکاندایە. ئەم مانگە پیرۆزەی کە هەمیشە بە لێخۆشبوون ڕازاوەتەوە، هەروەك پەیمانی هەموو ئەم

---

١. لە وڵاتی تورکیادا وەك عادەتێك لەنێوان منارەکانی مزگەوتەکاندا بە گڵۆپ و لە شێوەی ڕایەڵێکدا ئایەتێك، فەرموودەیەك، یان دەستەواژەیەکی وەك "بەخێربێیت ئەی مانگی ڕەمەزان!" دەنووسرێت. (وەرگێڕ)

شتە جوانانە بەوانە دەدات کە لە کەشوهەواکەیدا دەژین، بە هەمان شێوە چەندین کاریگەرییشی دەبێت لەسەر هەموو ئەو جۆرە کەسانەی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندییان بە دین و دینداریییەوە هەیە. ئەو، بە ئەفسوونە تایبەتەکەی، سنوورەکانی دڵی ئیماندار دەگۆڕێت و، ڕەنگی خۆی دەدات لە سروشتیان و، نهێنییە کراوە و داخراوەکانی سەبارەت بە جیهانەکانی ئەودیو دەکاتەوە بەڕووی ئەوانەدا کە لە دڵەوە باوەڕیان هێناوە، چەند ڕێگایەك دەکاتەوە بۆ مرۆڤەکان بۆ گەیشتن بە چەند بوونێك کە لە سەروو بوونی جەستەییەوەیە. بە هاتنی ئەو هەستە مرۆییەکان هەمیشە باسی ئەودیو دەکەن. هەستی ئەبەدییەت وەکو هەرە خۆشترین بۆنەکان بە گشت لایەکدا بڵاودەبێتەوە. ئەم کاتە پیرۆزە بەدرێژایی مانگێك قووڵترین شیعرەکانی بێدەنگیی دەدات بە گوێماندا کە هەرگیز نەمانبیستووە و، ئیمان و عیبادەت -کە دوو ماکی گرنگی ئەم شیعری بێدەنگییەن- دەست لەناو دەستی یەك، مەیدانێکی فراوانتر لە زانستەکان دەبەخشن بە بەسیرەتمان و، ئای چ ئاسۆگەلێکی ئەفسووناویی دەخەنە سەر پشت کە چاو لە بینینی تێر نابێت.

هەروەك چۆن ڕووناکیی خۆر لە شێوەی چەند شەپۆلێکی جیاوازدا و لەگەڵ هەموو بوونەوەرێکدا پەیوەندییەکی تایبەتیی هەیە، بە هەمان جۆر لە مانگی ڕەمەزاندا جیهانەکانی ئەودیوی ئاسمانەکان هەردەم کاریگەرییەکی جیاوازیان دەبێت لەسەر زەوی و، زەوینشینان و، بەتایبەتی باوەڕدارانی ناوی. جیهانە مەلەکوتییەکان چەندین بار لە ڕووناکیی خۆر زیاتر، بە گشت لایەکدا ڕۆح و مانا و ئەفسوون بڵاودەکەنەوە و، قووڵایی خۆیان دەدەن بە گوێی ئەو دڵانەدا کە کراوەن بەڕووی حەقیقەتدا و،

لەدوننییەتی خۆیان دەچێنن تیایاندا. لە سایەی ئەمەدا دنیا و عوقبا دێنە تەنیشتی یەك، لە یەکێکیان عیبادەت و گوێڕایەڵیی و، لەوەی تریشیان خێر و بەرەکەت هەڵدەقوڵێت و دەڕژێت. ئەم حاڵەتە خولیا و هەستی هێندە قووڵ لە مرۆڤدا بەئاگادێنێت، هیچ شتێکی تر لە دنیادا ئەستەمە ئەوەندە جوان و سیحرئامێز بێت. جاری وا هەیە کاتێك دەنگی بەرزبووەوەی ناو مزگەوتەکان لەگەڵ ڕووناکیی هەڵقوڵاوی فانۆسەکاندا ئاوێتە دەبێت و دەڕژێت بەسەرماندا، حاڵەتێك کە دڵمان دەخاتە خورپە و، چاومان بەر شەوارە دەخات، لە زۆربەماندا دەهێنێتە مەیدان و، هەرگیز نامانەوێت لەم کەشوهەوا ئەفسووناوییە جودا ببین. ئەگەر جیاشببینەوە دڵمان هەر لەگەڵ ڕووداوەکانی ئەوێدا لێ دەدات.

ئێمە لە ڕەمەزاندا هەموو ڕۆژێك هەست بە شادیی جەژن دەکەین و، لە هاتوچۆی نێوان ماڵ و شوێنی کار و مزگەوتدا هەمیشە هەست بە گەرمیی ئەو دەکەین و، خولیای چارۆکە هەڵدان بەڕووی ئاخیرەتدا دەکەوێتە سەرمان و، جاری وایە ڕووەو مزگەوت ڕادەکەین و، هەوڵ دەدەین دووریمان لە خوای خۆمانەوە تێبپەڕێنین و، بە دوعا و نیاز مەیلی خێر لە خۆماندا بەهێز دەکەین و، تێدەکۆشین بە تەوبە و داوای لێخۆشبوونیش خۆمان لە چڵکە مەعنەوییەکان پاك بکەینەوە. شەو و ڕۆژ لە سەرجەم بارودۆخێکماندا بەرامبەر بە خوای گەورە، ڕەنگی ژیان دەگۆڕین. بەم جۆرە ژیانمان لە مەتەڵێکی نەزانراو دەردەچێت و، دەگۆڕێت بە جوانیی و حەزێك کە دەڕژێتە ناخمانەوە و لە تامەکەی تێر نابین. بەتایبەت دەنگی بەگوڕی بانگ و، هەوای سەرسووڕهێنەری مەعنەویی مزگەوتەکان و، ئەو تەراویحانەی کە ژن و پیاو و گەنج و

پیر تیایدا بەشدارن، ڕەمەزان هێندە جوان دەکەن و دەیکەن بە "ئاسانێکی گران"ی وەها کە ئەوانەی بەتەواوەتی هەستی پێ دەکەن و تیایدا دەژین، لەکاتێکدا بەسەر زەویدا دێن و دەچن، وەك ئەوەی لەگەڵ دانیشتووانی ئاسمانەکان لە ڕیزێکدا بن، چەندین تێبینیی جیاوازیان بۆ دێت و، لە هۆشی خۆیان دەچن.

لە ڕەمەزاندا جاری وا هەیە هەستێکی ئاخیرەتیی هێندە قووڵ مزگەوتەکان دەگرێتەوە، -ئەمە کەمێك پەیوەندیی بە دەروونی شەخسەکانەوە هەیە- مرۆڤ بە جۆرێك گوێ بۆ دەنگی بانگی منارەکان هەڵدەخات وەك ئەوەی لە زاری بیلال بێنە دەر و، ئیمام ڕێك بە جێنشین و شوێنگری تەواوەتیی دەزانن و، ئەوانەی ڕاست و چەپیشیان وەك چەند کەسێك دێتە پێش چاو کە بە بینینی پێغەمبەر (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شەرەفمەند بوون و، هەتا سەر ئێسقان هەست بە جۆش و خرۆش دەکەن و، فرمێسك لە چاوانیان دەبارێت و، وا دەزانن تەنها هەنگاوێك دوورن لە بەهەشتەوە.

هەرچەندە من لە ئێستادا دوورم لە جۆش و خرۆش و کەشوهەوایەکی فراوان و قووڵی لەم جۆرەوە. ئەم جێگایەی کە هەنووکە منی تێدام مزگەوتێکی لەو شێوانەی تێدا نییە و، دەوروبەر تا بڵێی ساردە و، مرۆڤەکانیش لە ڕووی مەعنەوییەوە مات و سستن. لێرە هەرگیز گوێتان لە زایەڵەی ئەفسووناویی منارەکان نابێت، مزگەوت و پەرستگاکان وەکو لای خۆمان زیندوو و ڕەنگاوڕەنگ نین. جگە لەوەش دەڵێی مرۆڤەکان لە یەکتر دابڕاون. لەم ڕووەوە ئەگەرچی من چەندین کیلۆمەتر دوورم، بە بیرکردنەوە لەو ڕێز و سام و شکۆیەی کە مزگەوتەکانی

خۆمانیان بە هەستی ئاخیرەتیبوون ڕازاندووەتەوە و، بەندە ڕاستگۆکان لێوان لێویان کردووە، دڵنەوایی خۆم دەکەم. دێتە بەر گوێم هەناسە پاکەکانی نوێژخوێنان کە تەنانەت هەیوانەکانی دەرەوەشیان پڕ کردووە، سەڵات و سەلامیان لە نێوان نوێژەکانی تەراویحدا، ئەو دڵسۆزی و گەرموگوڕییەی کە لە دەنگیاندایە. جاری وایە چەند وێنەیەکی ژیانی ڕابردووم کە لە یادەوەریمدا ماوەتەوە سەرلەنوێ دەبووژێتەوە و، منیش لەم جۆرە کاتانەدا چاوم دادەخەم و، گوێ بۆ هەستەکانم شل دەکەم، خۆم یان لەسەر حەوزی مزگەوتێك، یان لەناو ئەو مرۆڤە بێگەردانەدا کە چەشنی فریشتەکان ڕیزیان بەستووە، یان لەسەر مینبەرێك، یان لە میحرابێکدا، دەبینمەوە و، تێدەکۆشم منیش تامی ئەو شتانە بکەم کە لەوێ ڕوودەدات. بۆئەوەی بەشی خۆمم دەست بکەوێت لەو ڕەنگ و دیمەنە جوانانە و، لەو دەنگە ڕوون و ڕەوانەی کە لە منارەکانەوە بەرز دەبێتەوە، هەست بە هەمان جۆش و خرۆشی کەسانی ئەوێ دەکەم.

تا لە ژیانیشدا بم هەمیشە بیر لەو ڕۆژ و شەوانە دەکەمەوە کە ناسکی و تام و چێژە مەعنەوییەکەی لە سەروو توانای تەسەوور کردنەوەمیە و، بە هەست و هەیەجان و عەشق و شەوقی ئەو "أیام الله"یانەی کە تەنها خەیاڵەکەی هەموو جیهان دێنێت، هەوڵ دەدەم ئەم کاتانەی حەسرەت و هیجران کە سەبارەت بە من بێدەنگ و بێکەسن، یان ئەم خولەکانەی غوربەت، ڕووناك بکەمەوە و، هەمیشە چاوەڕوانی ئەو کاتەم کە بێگومان بە هەر مانایەك لە ماناکان بووبێت ڕۆژێك دەگەڕێمەوە بۆ ئەو پارچە کاتە نوورانییانەی کە سەرشارن لە هەیەجان.

# شارستانێتیی

پێناسەی خەڵکی جاران بۆ شارستانێتیی بریتیی بوو لەوەی کۆمەڵێك مرۆڤ لە دەوری هەست و بیرە مرۆییەکان لە گوندێك، شارۆچکەیەك، شارێك یان هەر جێگایەکی تردا کۆببنەوە و پێکەوە مرۆڤانە بژین. ئادەمیزاد کە لە ڕووی ماهییەتەوە بە جۆرێك بەدیهێنراوە گونجاوە لەگەڵ بەشارستانیبووندا، لەوەتەی لەسەر زەوی پەیدابووە، ئەگەرچی بە گشتیی لە هەموو سەردەمێکدا توانیبێتی تا ئاستێك خاوەنی شارستانێتیی بێت، لە ڕاستیدا بەشارستانیبوونی ڕاستەقینە ئەو کاتانە دەرکەوتوون کە هێزی هەست و، بیرکردنەوە و، ئیرادەی مرۆڤ بە تەواوەتی تیایدا ڕەنگی داوەتەوە. بێگومان کەسانێکیش هەن کە بەشارستانیبوونی مرۆڤ لە سەرکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی بواری پیشەسازی و، کارە دەراساکانی زانست و تەکنەلۆجیا و، ئۆتۆمبێل و، شەمەندەفەر و، فڕۆکە و، بەلەم و، کەشتیی ئاسمانی و، شاری گەورە و، شەقامی فراوان و، بینای بەرز و، بەنداوەکان و، پاڵێوگەکان و، کارگەکان و، وێستگە ناوەکییەکاندا دەبیننەوە. بەڵام ئەمانە بە ئەندازەی ئاوێتەبوونیان بە هەست و بیرە

مرۆییەکان، ئەگەر هەریەکەیان هۆکارێکیش بن بۆ خۆشگوزەرانیی، هەرگیز بە بناغەکانی شارستانێتیی دانانرێن.

بەڵێ، دەگونجێت لە ڕێگەی هەلومەرج و هۆکارە مۆدێرنەکانەوە ڕوخساری ژیان بگۆڕێت، بەڵام هەرگیز بەمانە مرۆڤ نابێت بە بەدیهاتوویەکی شارستانیی. شارستانێتیی بریتییە لەو زەمینە لەبارەی کە تیایدا توانا و لێهاتن و بەهرە مرۆییەکان گەشە دەکەن، مرۆڤی شارستانییش ئەو کەسەیە کە هەست و بیرکردنەوەکانی فراوانبوونیان بەخۆوە دیوە و، بەو هەستە باڵایانەی کە پێشیخستوون چووەتە ژێر فەرمانی کۆمەڵگاوە.

لە ڕابردوو و ئێستاشدا هەندێك لە فرمیی و دەوڵەمەندیی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیدا بەدوای شارستانێتیدا گەڕاون و بە ناوی شارستانێتییەوە هەمان ئەم ئامانجەیان نیشانی خەڵکی ئاسایی داوە. دوای بەفیڕۆدانی ئەو هەموو کات و وزەیە و تەنها مانەوەی "تەمەنێکی بەهەدەرچوو" دوای ئەو تەقالایانە، ئایا نەدەبوو لەناو ڕۆح و، کامڵبوونی ڕۆح و، نوێبوونەوەی مرۆڤدا بەدوای شارستانێتیدا بگەڕاینایە؟ بەکورتی، دەبوو لەوە تێبگەیشتینایە کە شارستانێتیی کڵاوێك نییە بیکەینە سەرمان و، دەبوو لە سییانەی "کات - هەلومەرجەکان - مرۆڤ"دا هێدی هێدی وەرمانبگرتایە و، چاوەڕێی پێگەیشتنی هەلومەرجەکان و کامڵبوونی مرۆڤمان بکردایە و، لە ڕوانگەی لۆجیك و ژیرییەوە بناغەی پتەوی بۆ دابنرایە و، خەڵکانی عەوام نەخەڵەتێنرانایە..!

شارستانێتیی شتێکە و، بەمۆدێرنبوونیش شتێکی ترە. لە یەکەمیاندا

مرۆڤ و، بیرکردنەوەکان و، لایەنە مرۆییەکانی و، بۆچوونەکانی گەشە دەکەن و نویێ دەبنەوە. لە دووهەمیاندا چێژە جەستەییەکان و، هەلومەرج و هۆکارەکانی ژیان بەرەو پێش دەچن.

بەڵام ئەو نەوانەی کە بە هاتوهاواری چەمکەکان فریودراون، ئەوەندە ناو و چەمکەکان بە هەڵە دووپات کرانەوە، سەرەتا لە شێوازی دەربڕین و بیرکردنەوەدا خەڵەتێنران و، پاشان بەهۆی چاندنی کۆمەڵێك بۆچوونی چەوت و ناڕێك و گەنیو لە هزرەکاندا، لە دین و، زمان و، فەلسەفەی میللی و، ئەخلاق و، کلتووری خۆیان دوورخرانەوە. هەندێك لەو نەتەوانەی خاوەنی هۆکار و ئامێرە مۆدێرنەکانن و، ڕاستتر بڵێین نیمچە ڕۆشنبیرەکانی (!) ناو هەر نەتەوەیەك، خۆیان بە شارستانیی بینیوە و کەسانی بەرامبەریشیان بە دەشتەکیی ئەژمار کردووە و، بە ناوی شارستانێتیی و کلتوورەوە هەڵەیەکیان کرد کە مێژوو لێیان خۆش نابێت...

لەڕاستیدا هەروەك شارستانێتیی جیایە لە بەرزکردنەوەی هەلومەرجەکانی ژیان یان مۆدێرنیزە کردنیان، بە هەمان جۆر هەبوونی بڕوانامە جیایە لە بوون بە "ڕۆشنبیر". هەروەك دەکرێت ئاماژە بۆ چەندین ڕووناکبیر بکەین کە خوێندنێکی جددییان وەرنەگرتووە، بە هەمان شێوە ژمارەی ئەو خوێندەوارانەش کەم نین کە تەسکبین و، کۆنەپەرستن و، هێشتا کۆڵی دەشتەکێتییان لەسەر شان دانەگرتووە.

دەکرێت هاتوهاوار و تێکەڵ و پێکەڵیی چەمکەکان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ نەوەکان بخەڵەتێنێت. ژمارەی ئەو وڵاتانە زۆرن کە تیایاندا

بەدرێژایی چەندین ساڵ سپی بە ڕەش و ڕەش بە سپی قبووڵ کراوە و، تاجی عەدالەت لە سەری ستەم نراوە و، دادپەروەریی بووە بە ناونیشانی زوڵم و، ڕۆحە تاریکەکان خۆیان کردووە بە حەوارییەکانی ڕووناکی و، ڕووناکبیری ڕاستەقینە لەم دەرگا بۆ ئەو دەرگا دەرکراوە و، هەستیشیان بەوە نەکردووە کەوتوونەتە سەر چ ڕێگایەکی پڕ لە هەوراز و هەڵەت.

بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەك بگات بە ڕووناکی و، لە بیرکردنەوە و، تەسەوور و، قەناعەت و، دەربڕیندا لە ئاڵۆزیی ڕزگاری ببێت، پێویستی بە دەستەیەك ڕووناکبیری ڕاستەقینە هەیە. نابێت ڕۆشنبیریی لەگەڵ هەبوونی بڕوانامەدا تێکەڵ بکرێت. دەگونجێت کۆمەڵگایەك کەسانێکی هەبن کە لە بوارە جیاوازەکانی زانستدا پسپۆڕییان بەدەست هێنابێت و، خاوەنی پیشەوەران و بازرگانانی کارامە بێت، بەڵام ئەوەندە هەیە بۆ ڕووناکبوونەوەی ئەو کۆمەڵگایە، لە بوونی کۆمەڵە کەسانێك کە بوارەکانی فیزیا و، کیمیا و، بیرکاریی و، ئەندازیارییان خوێندووە، زیاتر پێویست بە کەسانێك دەکات کە لە ڕۆژگاری خۆیان تێگەیشتبن و، بەرزبوویێتنەوە بۆ ئاسۆی ژیانی دڵ و ڕۆح. ئەم کارە مەزنەش تەنها بە ڕووناکبیرانی ڕاستەقینەی خاوەن ئیرادەی بەهێز دەکرێت.. بەو ڕووناکبیرە ڕاستەقینە و ئیرادە بەهێزانەی کە بەو شەماڵانەی لەودیوەوە دێن، ئەو حەقیقەتانەی لە ڕۆحیاندا هەوێنی گرتووە، وەك پەمووی بەردەستی هەلاج شیدەکەنەوە و، سەرچاوەیەکی ئەمری ڕووناکی دادەگیرسێنن و، پاشان بێ وەستان پەیام بە چواردەوریاندا بڵاودەکەنەوە و، ڕێگای نوێی شارستانێتیی بۆ کۆمەڵگە والا دەکەن و ڕۆشنی دەکەنەوە و، ڕەهەندی نوێ دەبەخشن بە کلتووری میللی... شارستانێتیی و کۆمەڵگا بەرهەمی ئەمانەیە،

ئەمانیش میوەی بیرکردنەوەی ڕاست و، باوەڕی ڕاست و، کلتووری میللین.

هەموو شارستانێتییەکی نوێ بە عەشقێکی تازە و، بزووتنەوەیەکی ئیمانیی نوێ لەدایك دەبێت. لە هەر جێگایەك ئەم عەشق و ئیمانە نەبێت، شارستانێتیش بوونی نییە. بەتایبەت ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکدا ئەم ئیمان و هەیەجانە بوونی نەبێت و، خۆسەپاندن و نەبوونی ئازادیی نەهێڵێت توانا و لێهاتنەکان گەشە بکەن، ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکی لەم چەشنەدا لە سایەی زانستە جیاوازەکاندا مرۆڤەکانی ناوی بتوانن دەستیان بگاتە ئاسمانەکانیش، هێشتا ناتوانن بگەن بە ئاسۆی بەشارستانیبوون و ناکرێت باس لە هەبوونی شارستانێتیی بکرێت لەو جێگایەدا. تەنانەت لە شارستانێتییەکی وادا، ئەو بەرهەمانەی شارستانێتیش کە بە هەرچۆنێك بووە بەدەست هاتوون، زوو یان درەنگ مەحکومن بە پووکانەوە و لەناوچوون.

بەڵێ، ئەگەر کەسانی ناو کۆمەڵگەیەك خاوەنی باوەڕ و، عەشق و، لێپرسراوێتیی نەبن و، نەزانن لە کوێ و بۆچی دەژین، ئەگەر سەرلەبەری دام و دەزگاکانی کۆمەڵیش بگۆڕێت و، هەلومەرجەکانی ژیان بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر باش ببن و، هەموان لە جلوبەرگ و پۆشاکیاندا مۆدێرنیزە ببن، هێشتا ناتوانرێت ناوی "شارستانێتیی" لەم کۆمەڵگەیە بنرێت. چونکە هەروەك چەند جارێك ئاماژەمان بۆ کرد، شارستانێتیی ڕووداوێکە لەسەر ئاستی زیهن و ڕۆح، هیچ پەیوەندییەکی بە زانست و، تەکنەلۆجیا و، جلوبەرگ و، مۆبیلیا و، شتانی کەشخە و، ئۆتۆمبێل و، بیناوە نییە.

ئەگەر شارستانێتیی پەیوەندیی هەبووایە بەم جۆرە شتانەوە، ئەوا دەبوو بتوانین لە ماوەی چەند مانگێکدا مرۆڤێك و، لە چەند ساڵێکیشدا کۆمەڵگەیەك بکەین بە خاوەنی شارستانێتیی. بەڵام هەیهات!.. ئەوەی کە دوای ئەم هەموو بەمۆدێرنبوونە نەمانتوانیوە هەنگاوێك ژیانی عیرفانیمان بەرەو پێش ببەین، ڕوونترین و تاڵترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە چاولێکەریی ناتوانین ببین بە خاوەنی شارستانێتیی.

ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە خوێندەوارانی هەندێك لە "وڵاتە دواکەوتووەکان" سەرجەم ئەم "نابێت"انەیان وەکو "دەبێت" پیشانی خەڵکی ڕەشۆك دا و، هەڵیانخەڵەتاندن و، هەوڵیان دا هەندێك لە هەڵمەتی بەمۆدێرنبوون بە جووڵانەوەی شارستانێتیی نیشان بدەن. لەڕاستیدا هەموو ئەم بۆچوونانەی کە پاشماوەی بیری داگیرکارین و لەژێر ناوی هەڵمەتی بەشارستانیبووندا دەرخواردی ئێمە دەدرێن، بریتییە لەو هەوڵەی کە ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لە لایەن هەندێك لە دۆستە ڕۆژئاواییەکانمانەوە(!) بە مەبەستی گرتنی ئەو ڕێگایانەی دەمانگەیەنن بە شارستانێتیی ڕاستەقینە و، لەناوبردنی بناغەکانی، وەکو چەند بیردۆزێك پێشنیار کراون و، هەوڵ دراوە کودەتا بەسەر دین و، زمان و، شێوازی بیرکردنەوەماندا بکرێت و، زیهنییەتێکی زۆڵ و تێگەیشتنێکی لار لە جێگایاندا دابنرێت. باسکردنی ئەوەی داخۆ ئەوان تا چ ئەندازەیەك لەم کارەیاندا سەرکەوتوو بوون دەخەینە لاوە، بەڵام چاولێکەرانی ناوەکی لە هەموو ئەو شتانەدا کە دەرەکییەکان ئارەزوویان دەکرد و دەستیان نەیدەگەیشتێ -بە شێوەیەکی هێندە لێزانانەش کە نەیانهێشت ببێت بە هۆکاری بزواندنی پەرچەکرداری میللی- ئەوەندە بە

سەرکەوتوویی ڕۆڵی خۆیان بینی، بە سەد هێرشی خاچپەرستییش ئەوە نەدەکرا کە ئەوان کردیان!..

بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییدا کۆبوونەوەی نەتەوە لە دەوری ڕۆحی میللی و، هێنانە مەیدانی سەرنجڕاکێشترین و بەربڵاوترین بزووتنەوەی دامەزراندنی شارستانێتیی تایبەت بە خۆی، پلان و پڕۆژەی ڕۆژئاوا و شەیدایانی ناوخۆیی ئەویان ژێرەوژوور کرد. ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئەو نەوانەی کە ناڵای داهاتوو لەسەر شانیان هەڵدەگرن، ئەوەیە کە بە باوەڕێکی بەهێز و، هەوڵێکی نەبڕاوە و، ئیرادەیەکی نەبەرد بەردەوامیی بەم کارە بدەن و شارستانێتیی خۆیان بپارێزن.

# کۆچی پیرۆز

کۆچ، سەبارەت بەو ئادەمیزادەی لەو ڕۆژەوەی دروست کراوە ڕاوەستانی بەخۆوە نەدیوە بە گشتی و، سەبارەت بە کاروانی ڕووناکی مرۆڤە هەڵبژاردەکانیش بەتایبەتی، چەمکێکی یەکجار گرنگە و، لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکی نزیکیشی بە مێژووی شارستانێتییەکانەوە هەیە.

بەڵێ، لە لایەك کەسانێکی نامۆ و بێکەس کە دەرچوون بۆ گەشتێکی دوور و درێژ لە سکی دایکەوە بۆ منداڵیی و، لە منداڵییەوە بۆ گەنجێتیی و پێگەیشتن و، پاشان لەویشەوە بۆ پیری و مردن.. لە لایەکی تریشەوە چەند ڕابەر و پێشەوایەکی مەزن کە بە مەشخەڵەکانی دەستیان سەردەمەکان ڕووناك دەکەنەوە و، مۆری خۆیان لە چەندین دەورانی جیاواز دەدەن و، لەو ڕێگا نوورانییانەدا کە کردوویانەتەوە هەمیشە شوێنکەوتووانیان لە لوتکەکانی شارستانێتیدا دەگێڕن و، بەو پزیسکەی کە لە سینەیان هاویشتوون ڕۆحیان ڕۆشن دەکەنەوە و، بە ئیمان و ئومێد بۆ ئەبەدییەتیان ئامادە دەکەن و، لە هەمان ئەو جێگایانەدا کە تاریکیی

و نائومێدیی فەرمانڕەوان، ئەوان بە یارمەتی بیرە ڕووناکەکانیان لە ناوجەرگەی تاریکییەکانەوە نوور و ڕەنگەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێنن و، کێڵگەی ئومێد دەهێننە مەیدان. ئەمانە هەریەکەیان ڕێبوارن و بەدرێژایی تەمەنێك هەمیشە لە کۆچ کردندان. کۆچێکی نەبڕاوە لە پێناو باوەڕ و بۆچوون و پەیامیان...

ئیمان و کۆچ و جیهاد کە بناغە و ڕووکارە جیاوازەکانی یەك حەقیقەتن، لە قورئانی پیرۆزدا بەزۆری بەدوای یەکدا باس کراون و، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر بایەخ و گرنگیی ئەم بابەتە. باوەڕهێنان، کۆچ کردن، هەوڵدان لەپێناو باوەڕدا و، بێ وەستان و ماندووبوون تێکۆشان بۆ گەیاندنی پەیام بە چەند وەرگرێکی جیاواز لە چەند شوێن و هەلومەرجێکی جیاوازدا.. ئەمە ئەو کانیی خزرە سێ پلوسکەییەیە کە بەیانیان و ئێواران قودسییەکان سەری لێ دەدەن! ئەوانەی لەم سەرچاوەیە ئاو دەخۆنەوە، بە ئیمان و باوەڕ دەهەژێن و، هەمیشە پشکۆ لە سنگی تاریکییەکان دەهاون. کاتێکیش ڕێگاکان دەبن بە هەوراز و نشێو و، هەڵە و ناڕەحەتیی و هەست و خووی نەفامیی هەموو لایەك دەتەنن،ماڵ و منداڵ و، خانە و لانە جێدەهێڵن و، دەڵێن "دییارێکی ترا" و، دیسان دەکەونەوە کۆچ کردن.

پەیام چەند بەرز و، هزر چەند ئەسڵی و بەسوود بێت، هێشتا هەندێك لەوانەی کە یەکەم جار گوێیان لێ دەبێت، بەبێگومانی ڕووبەڕووی دەبنەوە و کێشەی بۆ دەنێنەوە و، ئەمەش لە ڕوویەکەوە سروشتییە. لەبەر ئەوە هەرکەسێك بیەوێت ئیمانێکی نوێ و، عەشق و هەیەجانێکی تازە لە کۆمەڵگەی خۆیدا بەرپا بکات، پێویستە یان لە شوێنی خۆیدا بە شێوەی

ئاشکرا یان نهێنیی و داخراو هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچوونی خۆی بدات، یان بە مەبەستی گەیاندنی ئیلهامەکانی دڵی و ئەو پەیامانەی کە لێپرسراوە لە گەیاندنیان، کۆچ بکات و بەدوای نیشتمانێك و کەسانێکدا بگەڕێت کە کڕیار و نرخشناسی ئەو حەقیقەتانەن.

لە حاڵەتی یەکەمدا پێویستە هەموو تاکێك کە دڵی داوە بەو بیر و باوەڕە، تا بڵێی وریا و بەئاگا بێت و، هەر لە سەرەتاوە دەست لە هەموو شتێك بشوات کە خاوەنیەتی. ئەگینا نەك هەر ئەو ڕووناك کردنەوەیەی کە ئومێد دەکرێت نایەتە دی، بەڵکو زۆر جار تەنها یەك بێناگایی و تۆزێك هەڵە، دەبن بە هۆکاری ئاڵۆزبوونی هەلومەرجەکان و، گۆڕانی کەشوهەوا بۆ مەیدانێك کە چیتر شایانی ژیان نییە... زۆر گرانە هەموو کاتێك سەرجەم تاکەکانی ئەو کۆمەڵە لەم حاڵەتی وریایی و بێدارییەدا بن، تەنانەت لەبەر ئەوەی ئەستەمە، ئەوا لە ڕوویەکەوە پێویستە پرۆسەی ڕووناك کردنەوە و بانگەواز لە هەرێمێکی تریشدا بەردەوام بێت. ڕەفتاری پێچەوانەی ئەمە و بەرەنگاری کردن هیچ جۆرە سوودێکی نییە.

لەوەتەی هەیە هەموو بۆچوونێکی نوێ لەو شوێنەدا کە لەدایك بووە بە سووك تەماشا کراوە و، پێڕی لە دژ گیراوە و، لە بەرامبەر ئەمەشدا زۆر جار جێگایەکی تر -کە سەردەمی منالیی و گەنجێتیی ئەو بۆچوون و نوێنەرانی ئەو بیروباوەڕە نازانن- باوەشیان بۆ کردوونەتەوە و یارمەتییان داون.

هەر بۆیە لە ژیانی قودسییەکاندا ئەم هێڵە نەگۆڕانە وەك قەدەرێکی هاوبەش وایە: سەرەتا ئیمان و عەشق، پاشان ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو

هەڵە و لادانانەی کە کۆمەڵگای گرتووەتەوە، دواتر ئەگەر پێویستی کرد لەبەر خاتری بەختەوەریی مرۆڤایەتی، فیداکردنی خانە و نیشتمان و هەموو شتێکی تر و، دیسان کەوتنە ڕێ بە مەبەستی گەڕان بەدوای چەند دڵێکی ئاشنای تردا...

لە هەموو ژیانەوە و زیندووبوونەوەکاندا ئەم دوو بناغە و ئەم دوو قۆناغە زۆر گرنگن. قۆناغی یەکەم بریتییە لەوەی تاك شەخسییەتی خۆی بەدەست بهێنێت، بە باوەڕ باڵ بگرێت و بە عەشقیش بهەژێت، نەفس و منێتیی خۆی تێپەڕێنێت و ببێت بە بەندەی تەواوەتیی خوای گەورە. جیهادی ئەم قۆناغە بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە بریتییە لە هەڵگیرساندنی جەنگ دژی زیادەڕەوییەکانی نەفس و، سەرکەوتن بەسەر ئەنانییەتدا و، مرۆڤ سەرلەنوێ خۆی بنیات بنێتەوە. لەم ڕووەوە ئەمە "گەورەترین جیهاد"ە. قۆناغی دووهەمیش بریتییە لە بڵاوبوونەوەی ئەو پشکۆ و پزیسکی باوەڕەی کە لە دڵی هەریەکێك لە شوێنکەوتووانیدا تاوی سەندووە، لە شێوەی چەند شەپۆلێکی جیاوازدا و بە گشت لایەکدا. زۆربەری جار لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا، کۆچ و هیجرەتیش دێت و لە دەرگا دەدات.

لەڕاستیدا هەتا دەگاتە ئەم هیجرەتە ماددییە، دەکرێت باس لە چەند کۆچێکی تریش بکەین کە پێشتر و لەسەر ئاستی ڕۆح ڕوودەدەن. کۆچی مرۆڤ لەو حاڵەتەی ئێستا تیایدایەتی بۆ ئەو حاڵەتەی کە پێویستە تیایدابێت، کۆچ لە سستی و پەرێشانییەوە بەرەو ڕێسا و وزە، کۆچ لە مەنگ بوون و بۆگەن بوونەوە بەرەو خۆنوێکردنەوە، کۆچ لە کەشوهەوای خنکێنەر و ژەهراویی گوناهەکانەوە بەرەو بەرەزبوونەوە بە

پلەکانی ژیانی ڕۆح و دڵدا.. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا مانایەك لە ماناکانی هیجرەت خۆی دەنوێنێت و، لەم ڕووەشەوە باوەڕدار هەمیشە لە کۆچ کردندایە. بەڕای ئێمە بۆ ئەوەی هیجرەتی دووهەم بەتەواوەتی هەستێت بە فەرمانی خۆی و کامڵ ببێت، پێویستە سەرەتا هیجرەتی یەکەم ڕووبدات و پێگەیشتبێت. ئەوانەی سەرکەوتوو بوون لە کۆچ کردن لە جەستەوە بۆ ڕۆح و، لە زرقوبرقی ڕواڵەتییەوە بۆ شکۆمەندیی ویژدان و، لە توێکڵەوە بۆ کاکڵە، لە هیجرەتەکەی تر و ڕووداوەکانی دواتریشیدا سەرکەوتوو دەبن. ئەوانەش کە ناتوانن بە ڕێکوپێکیی لە خۆیاندا بەرجەستەی بکەن، زۆربەری جار ناتوانن بە تەواوەتی نوێنەرایەتیی هیجرەت و ئەو شتانەش بکەن کە وابەستەن پێیەوە.

هیجرەت بەم مانا فراوانە سەرەتا لە لایەن خۆر و مانگەکانی ئاسمانی مرۆڤایەتییەوە داهێنرا، وەك حەزرەتی ئیبراهیم و، حەزرەتی لوط و، حەزرەتی موسا و، حەزرەتی عیسا (عَلَيْهِمْ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامِ). پاشان ڕابەری بێوێنەی ئەم کاروانە ڕووناکە، مایەی شانازیی مرۆڤایەتی، سەرداری "کات" و "شوێن" (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، ئەم ڕێگایەی گرتە بەر. دەرگاکەشی هەتا قیامەت بە کراوەیی جێهێشت...

هیجرەت لەپێناوی خوادا و لەبەر خاتری ئەو هێندە پیرۆزە، ئەو هاوەڵە پیرۆزانەی کە لەپێناو باوەڕەکەیان و ڕابەرەکەیاندا گیان و ماڵی خۆیان بەخت کرد، لە کاتێکدا خاوەنی چەندین سیفەتی بڵندن و لە چەندین ڕووەوە خۆشویستراون، کەچی دەبینین لەبری هەر سیفەت و ناونیشانێکی تر ناوی "کۆچەر"یان بەسەردا دەبڕێت. ئەمەش مانایەکی زۆر گەورەی تێدا حەشار دراوە! تەنانەت کاتێك گەڕان دەستی پێ کرد بەدوای دانانی

سەرەتایەك بۆ مێژووی ئەم مرۆڤە بەڕێزانە، چەندین ڕووداوی گرنگی گەوهەرئاسا هەبوون وەك لەدایكبوونی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، دابەزینی وەحی، قبوولكردنی ئیسلام لە لایەن خەڵكی شاری مەدینەوە، جەنگی بەدر، فەتحی مەككە... هەڵبژێررانی هیجرەت لەناو هەموو ئەم ڕووداوانەدا، بابەتێكی گرنگی وایە كە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بكرێت.

كاتێك تاك لەپێناو ئامانجێكی باڵادا كۆچ دەكات، لە هەموو چركەیەكی ژیانیدا هەست بە پەستان و فشاری هۆكاری هیجرەتەكەی دەكات لەسەر ویژدانی و، خۆی بە ناچار دەزانێت ژیانی بەگوێرەی ئەم هەستە باڵایە ڕێك بخات. جگە لەوەش تەنها بە كۆچێكی پیرۆزی لەم شێوەیە دەتوانێت بێ ترس و بە ئازادی هەڵسوكەوت بكات و، خۆی بدزێتەوە لە نیگای سووك تەماشاكاری ئەو كەسانەی كە شایەتحاڵی تافی منداڵیی و لاوێتیی ئەو بوون. چونكە هەموو كەسێك لەو جێگایەدا كە سەردەمی منداڵیی و گەنجێتیی تێدا بەسەربردووە، ڕەنگە چەند خاڵێكی لاوازی هەبێت كە دوژمنانی دەتوانن ڕەخنەی ئاڕاستە بكەن. بەڵام بەپێچەوانەوە لەو شوێنە نوێیەدا كە هیجرەتی بۆ كردووە، هەمیشە بە حاڵەتی پاك و، بیركردنەوەی بێگەرد و، فیداكارییە سەرسووڕهێنەرەكەیدا دەناسرێتەوە و، هەموو كاتێك ڕێزی لێ دەگیرێت و نرخی دەزانرێت. سا یان لە سایەی ئەم هۆكارانەدا بێت یان بەهۆی چەند هۆكارێكی ترەوە، لەوەتەی دنیا هەیە بەزۆریی نەتەوە كۆچبەرەكان ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕیوە و، گۆڕانی ڕیشەیی و بنەڕەتییان لە مێژووی مرۆڤدا دروست كردووە.

بەرای زانایانی کۆمەڵناس زۆربەی زۆری ئەو شارستانێتییانەی لەسەر زەویدا دروست بوون، لە لایەن ئەو تاك و کۆمەڵانەوە بنیات نراون کە کۆچیان کردووە. تۆینبی (Toynbee)ی مێژووناس باس لە بیست و حەوت شارستانێتیی دەکات کە کۆچبەرەکان دایانمەزراندووە، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەنزیکەیی بەدرێژایی هەموو سەردەمەکان رەوەند و کۆچبەران فەرمانرەوای سەر زەوی بوون. کەس نەیتوانیوە رووبەرووی ئەم رۆحە پرلە وزە و بزۆکانە ببێتەوە کە خۆیان رادەستی حەوانەوە و خۆشگوزەرانیی نەکردووە و، هەموو کاتێك ئامادە بوون بۆ جیابوونەوە لە هەموو شتێك و، پێشتر لەگەڵ هەموو ئەو نارەحەتییانەدا راهاتوون کە دەکرێت لە گوزەرگاکەیاندا بێتە رێیان و، هەمیشە وەك سەربازێك چاوەرێی فەرمانی رۆیشتنن.

ئەوە یەکەمین قودسییەکان و ئەوەش یەکەمین مامۆستایانی شارستانێتیی! ئەوەش ئەوانەی کە لە چەند هۆزێك ئیمپراتۆرییەتێکی جیهانییان بنیات ناوە! ئەم مرۆڤانەی کە چەشنی هەورەبروسکە دابەزیونەتە سەر سنگی چاخە تاریکەکان، رەحمەتیان لە زەحمەتدا دیتووە و، زیندوو مانەوەیان لەوەدا بینیوەتەوە کە مەرگ و هەموو شتێکی تر بە بێبایەخ بزانن و، مانەوەی هەمیشەییان لەوەدا بینییەوە کە بەگوێرەی هەلومەرجەکان خۆیان نوێ بکەنەوە و، هەریەکەیان بوون بە هێزێك کە رووخاندنیان ئەستەم بێت.

خۆزگە دەمانتوانی نەوەکانی ئەو رۆژگارەشمان لە حەوانەوە و، خۆشگوزەرانیی و، نەفسپەرستیی و، شوێنکەوتنی ئارەزووەکان رزگار بکەین و، پرچەکیان بکەین بە هەستە مەزنەکان و، بمانکردنایە بە

چەند مرڤێکی نموونەیی کە زیاتر ئازار دەچێژن و زۆرتر هەست بە ژان دەکەن. لەوانەیە ئەوکات تێکرای نەتەوەکەمان لە کاریگەریی حساباتی بچکۆلانە و، چێژی سووك و نزم ڕزگاری ببێت و، هەرگیز لە ترسی چەند نارەحەتییەکی کەمنرخ و بێبایەخ ڕێگا و ئاراستەی خۆمان نەدەگۆڕی...

# پارچە ئاڵتوونییەکانی
# کات

# پارچە ئاڵتوونییەکانی کات

لەوەتەی دنیا هەیە زۆربەی خەڵکی گلەیی و سکاڵایان لەو کات و سەردەمە کردووە کە تیایدا دەژین و بە خولیا و هیوای ڕۆژانی باشترەوە هەردەم ناڵاندوویانە. بێجگە لەو کاڵفامانەی کە لە ڕووی جیسمانییەت و چێژە ماددییەکانەوە خۆیان هەڵداوەتە باوەشی ژیانی ئاژەڵانەوە و، وتوویانە "ڕابردوو و داهاتوو هەمووی ئەفسانەیە، لە ئێستادا ڕابوێرە و ژیانی خۆت تاڵ مەکە"، زۆرێك لە خەڵکی یان وابەستەی ڕابردوون یاخود دڵیان پەیوەستی داهاتووە. بەگشتی گەنجان و دڵگەرمەکان زیاتر لەو داهاتووەدا دەژین کە لە خولیاکاندا خوڵقاندوویانە و، بەتەمەن و پێگەیشتووەکانیش هەمیشە لە ڕابردوودا خۆیان دەبیننەوە.

لەڕاستیدا ڕابردوو مانایاکی جیاواز و، ئایندە بایەخێکی تایبەتی و، ئێستاش نرخ و بەهایەکی جیاوازی هەیە. کاتێك لەو کۆشك و تەلارە ڕازاوانەی داهاتوودا کە لە خەیاڵماندا بنیاتمان ناون و، لە لاپەڕە پرشنگدارەکانی ڕابردوودا بەدوای 'کات'دا دەگەڕێین، ئەو پارچە ئاڵتوونییەی کە پێویستە لەسەری هەڵوێستە بکەین و بایەخی پێ بدەین،

لە دەستمان دەردەچێت. کاتێکیش چاو لە ئاستی دوێنێ و سبەینێدا دەنوقێنین و، تەنها لەگەڵ ئەمڕۆدا ئاوێتە دەبین، ئەگەر بە "ئەمڕۆ"ش بتوانین دڵنەوایی خۆمان بدەینەوە، ئەوا دوو سەرچاوەی گرنگی ژیان دەدۆڕێنین.

لەکاتێکدا ڕابردوو بریتییە لە سەرچاوەیەکی بەپیتی وا کە دەکرێت ببێت بە کانگای ئەمڕۆ و ئاییندەمان و، ئەمڕۆش بریتییە لە ئەمامگەیەکی پیرۆز کە ئەمام و درەختەکانی داهاتوو بەخێو دەکات و سەرمایەیەکی نەتەوەییە، کەچی مامەڵە کردن لەگەڵ ڕابردوودا وەك ئەوەی ئەرشیفێکی کراوە بێت بۆ هەست و بیرکردنەوە ڕۆمانتیکییەکان و، ئەمڕۆش کاتی ئاهەنگ گێڕانی دڵە بەرەڵاکان بێت و بە مەستیی و وڕێنە بەسەری ببەن، هیچ نییە لە دۆڕانێك زیاتر، لەکاتێکدا کە دەبوو سەرچاوەی بردنەوە بێت.

ئەو کەسانەی هەموو تەمەنیان لە زیندانی جەستەدا بەڕێ دەکەن و، بەدرێژایی تافی لاوێتییان وا دەزانن ژیانیان لە بەختێکی ڕوون و ئاسوودەییەکی هەمیشەییدا بەسەر دەچێت و، هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە خۆیان و هەموو شتێکیش فانی و لەناوچووە. کاتێکیش وەرزی بیرکردنەوە دێتە پێشەوە نازانن چۆنی بیربکەنەوە و، بەدەم ئاخ و داخ و حەسرەتەوە دەڵێن "تومەز لەو کاتەوەی هاتووینەتە دنیا هەموو شتێك دەستی کردووە بە خواحافیزیی کردن لێمان. تومەز خەندەی هەموو شتێك بۆ ئێمە، زەردەخەنەی ماڵئاوایی بووە و ئێمە پێمان نەزانیوە! چۆن وابەستەی ئەم سەیرانە چوار پێنج سەعاتییە بووین، تا وامان لێ هات هەنگاوێك پێشی خۆمان نەبینی! تومەز هەمان ئەو ڕۆژەی هاتووینەتە

ژیان، پەیام و ئاماژەی خۆئامادەکردنمان بۆ ڕۆیشتن وەرگرتووە. وە لەو ڕۆژەوە هەمیشە بەرەو ئەم چاڵە نەزانراوە بەربووینەتەوە و، بە خۆشمان نەزانیوە. ئەمێستا دەبینین هەموو ئەو شتانەی بینیومانن و خۆشمانویستوون، خۆشمانویستوون و پابەندیان بووین، بەخێرایی لێمان دوور دەکەونەوە و، تەنانەت دەرفەتی وتنی "ماڵئاوا"شمان بۆ ناڕەخسێت!"

ماڵئاوا گەنجێتیی و جوانی! ماڵئاوا چێژ و سەفا! ماڵئاوا خۆشی و شادی و بەختەوەری! ماڵئاوا ئەی ئەو ڕۆژانەی کە بە فیزەوە بەنێو مەشخەڵی هیواکاندا تێپەڕدەبووین! ماڵئاوا ئەی خولیاکانی ئاسوودەیی، ئەی خەونەکانی بەختەوەری! ماڵئاوا ئەی هەموو ئارەزوو و خەون و ئومێدەکان..!

ئەمانە لەناو ئەم تەم و غوبارە خنکێنەرەدا پێش ئەوەی بچنە ناو گۆڕەوە دەمرن و، تێکەڵاوی مردووان دەبن و، لە هەموو چرکەیەکدا هەست بە چەندین مەرگ دەکەن. سەبارەت بەم جۆرە کەسانە ئیتر ئەم ئەندازە جیا جیایانە هەرگیز جارێکی تر لە تەنێکدا کۆنابنەوە و، ئەو توخمانەش کە لە یەکتر دابڕاون، تازە جارێکی دی پێکنایەنەوە و، هیچ هیوایەکیش نییە بۆ سەرلەنوێ ژیانەوەی ڕۆژانی کۆن.

بەڵام ئەو ڕۆحە بەختەوەرانەی کە دەتوانن پێکەوە و بە یەکجار لە دوێنێ و ئەمڕۆ، ئەمڕۆ و سبەی بڕوانن، دیدی ئەمان سەبارەت بە بوونەوەر و ڕووداوەکان تەواو جیاوازە. تەنانەت ئەوانەشیان کە هەلی خوێندنەوە و بیرکردنەوەی زۆریان بۆ نەڕەخساوە، بیرکردنەوەیان دەربارەی ژیان و مەرگ زۆر لەوانەی تر ڕێکوپێکتر و، تێگەیشتنیان قووڵتر و،

هەڵسەنگاندن و بڕیارەکانیان گونجاوتر و دروسترە. مرۆڤێکی بەختەوەری دڵ زیندووی لەم جۆرە، ڕوانینەکانی پەیوەندییەکی قووڵ گرێ دەدات لەگەڵ هەموو شتێکدا کە لەسەری دەنیشێتەوە، هەڵسووکەوتەکانی وریایانەیە و بەسیرەتی لێ دەتکێ، ڕەفتار و جووڵەکانی بە توندیی پەیوەستی ئەرك و فەرمانەکانیەتی، ویژدانی ئەو حەقیقەتە دەزانێت کە شوێن و کاتە لەناوچووەکان دەگۆڕێن بۆ چەند کات و شوێنێکی هەمیشەیی. تەنانەت گەرداوەکانی مەرگیش دوورەدەستترین چێژەکانی بەختەوەری بە ڕۆحی ئەو دەبەخشن.

لە ڕوانگەی هەستیار و کامڵی ئەودا هەموو جیهان و بوونەوەرە فانییەکان، دەگۆڕێن بە چەند بوونەوەرێکی مەعنەویی هەتاهەتایی و، هەموو ئەو شتانەش کە لەم دنیایەدا جوان و سەرنجڕاکێشن، دەگەن بە نرخی ڕاستەقینەی خۆیان لە دواڕۆژدا و، لەبری ئەو خەم و ئازارەی کە لە سینەی بێئاگایاندا قوڵپ دەدات، ئەو وەك هەنگێك کە لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ بفڕێت، لەم حەز بۆ ئەو حەز دەڕوات.

لە ڕوخساری درەخشانی ئەم جۆرە کەسانەدا حاڵەتێکی ئەفسووناویی کە پێکهاتووە لە تێکەڵەیەکی خاکی بوون و، خۆبەکەمزانی و، ویقار و، ئاسایش، نیشانەی ئەوەیە کە ئەوان هاوشانی فریشتەکان ئەسپ تاو دەدەن و، ئاماژەی ئەوەیە کە دڵیان کراوەیە بەڕووی هەزار و یەك ئیلهام و واریداتدا و، هێمای ئەوەیە کە دراوسێ و تێکەڵاوی ڕۆحانییەکانن. لەواندا فیزیك و مێتافیزیك لەناو یەکدان و، فیزیك تەواوکاری مێتافیزیکە و، ماددەش وەك بلێی ڕەهەندێکی بەنرخی مانایە. پێیانەوە دیارە کە بە قووڵی و نهێنیی هەست بەوە دەکەن ئەوەی باوباپیرانێکن کە لە ڕابردوودا

چەندین دەوڵەتی شکۆداریان بنیات ناوە. هەروەها لە هەرێمی ئەو شەوە ڕووناکانەوە کە تیایاندا بەدەم وتنی "هو"وە پەروازیان کردووە و، کراوەبوون بەڕووی گوفتاری خوا و، فەرموودەکانی پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و، بیستنی قورئاندا، بێگەردییەکی قووڵ و، ویقارێکی هەژێنەر و، جددییەتێك لە نێوچاوانیاندا ماوەتەوە. دەڵێی هەموو حاڵەتێکیان بێ بەکارهێنانی دەنگ و وشە شتانێك دەردەبڕێت و، ئەفسووناویترین وتارەکان دەهێننە سەر زمان.

لە دنیای گەرموگوڕ و زیندووی ئەواندا هەموو شتێك بە چێژ و شیرینییەکی جیاوازەوە لەدایك دەبێت و لە خەتێکی سەروو کاتدا بەردەوام دەبێت. ڕابردوو، بە هەزار و یەك ئاواز جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکانی داهاتوو ئامادە دەکات. داهاتوو، وەك ئەوەی پارچە زەوییەك بێت و چاوەڕوانی ژیانەوە بکات، بە ئەندازەی بەرزیی هزر و فراوانیی خولیاکان، سنگی خۆی دەکاتەوە بۆ ڕووداوەکان. ئەم کاتی ئێستایەش کە تیایدا دەژین وەك تانوپۆی جۆلایەك لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا دێت و دەچێت و، پارچەی خۆی دەچنێت.

لەم دنیا ڕووناکەدا، تەنانەت لە ڕۆیشتن و ئاوابوونی بوونەوەرە فانییەکانیشدا، هەمیشە ئاوازی دڵنەوایی بەخشی ئەبەدییەت دەبیسترێت و، هەست بە خزانی بوونەوەران دەکرێت لە لەناوچوونەوە بۆ نەمریی. لێرە شتان هێندە گەرم و سەنجڕاکێش و، ئەو هەوایەی کە زیندەگیی بە هەموو لایەکدا پەخش دەکات ئەوەندە نەرم و پاك و، بەرگەهەواش کە بە قۆڵە نەرمە ئاوریشم ئاساکانی باوەشی کردووین ئەوەندە بەسۆز و میهرەبان و، ئاسمانیش بە ئەستێرەکانی ناوییەوە کە چاومان لێ دادەگرن هێندە سەرسووڕهێنەر و شکۆمەندە کە، مەحاڵە ئەمانە ببینین و کەچی بێدار

نەبینەوە، بێدار ببینەوە، کەچی دەستە میهرەبانەکەی پشتەوەی هەست پێ نەکەین، هەستی پێ بکەین، کەچی نەگەین بە خۆشەویستیی و بەختەوەریی.

ئای ئیمان چ ئیکسیرێکی سەرسوورهێنەر و، مەعنەوییەت چ گەنجینەیەکی نەبڕاوە و، ڕابردوو چ سەرچاوەیەکی پاك و، داهاتوو چ باخچەیەکی بەفەڕ و، ئێستاش بە خۆی و هەزار و یەك دینامیکەوە چەند سەرمایەیەکی مەزنە..!

جارێکی تریش
یادی تۆمان کردەوە

# جارێکی تریش یادی تۆمان کردەوە

لەدایکبوونی تۆ بوو بە لەدایکبوونی مرۆڤایەتی. دۆست و دوژمن لە سایەی ئەو نوورەدا کە تۆ پرژاندت هەلی زانین و هەڵسەنگاندنی ڕاست و هەڵەکانی خۆی بۆ دەرکەوت و، ئەگەر بە ڕێژەیەکی دیاریکراویش بێت گەیشت بە دڵنیایی. ئێمە ئەو بەهەشت و ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییەی کە لە دڵماندا هەستی پێ دەکەین، تەنها بەهۆی بەیاننامە ئاسمانییەکەی تۆوە بە ڕاستیی خوێندمانەوە و لێی تێگەیشتین. وە لە سایەی کانیاوە ئەفسووناوییەکەی تۆدا ڕوومان کردە ئاسۆی تێگەیشتن لە موڕاد و ویستی خوایی.

ئەگەر ئەمڕۆ کەم تا زۆر چاوەکانمان بە پیرۆز ڕاگرتن و بەرز نرخاندنی حەق دابخەین و بکەینەوە و، دڵەکانمان بە جۆش و خرۆشی بەیەکگەیشتن لێ بدات، ئەوە تۆیت کە ئەم هەست و نەستە بالآیانەت تێدا ورووژاندووین.. تۆ لوتکەکانی بوون بە مرۆڤی ڕاستەقینەت پیشان داوین، ئەوە تۆیت کە بە هاویشتنی پشکۆی خۆشەویستیی بۆ ناو سینەکانمان، لەپڕێکدا تامی نەشوەی عەشق و بەیەك شادبوونەوەت پێ

چەشتووین و، نهێنیی هەبوونی ڕاستەقینەت داوە بە گوێی ئەوانەدا کە بە ڕێزەوە ڕوویان لە هەرێمەکەت کردووە.. ئەوە تۆیت کە بەرز نرخاندن و، پشت ڕاستکردنەوە و، شایەتیی ملیۆنان، بەڵکو ملیاران مرۆڤت بەدەست هێناوە و، چەند بنەمایەکی جێگیرت پێشکەشی ڕۆحە بەویژدانەکان کردووە.

ئەو دڵانەی کە لە سایەی تۆدا چاویان بە مەعنەوییەت و خۆشەویستیی کراوەتەوە، دەڵێی تەنها خۆشەویستی و ڕێز هەڵدەمژن و، بەو دەنگە مەزنانەی کە لە ڕۆحیانەوە بەرز دەبێتەوە و بەو وشانەش کە فراوانیی مرۆڤێتییان دەردەخەن، هەمیشە و بەدرێژایی سەردەمەکان نوێنەرانی ڕاستەقینەی بەها مرۆییەکان بوون. زۆربەی هەرە زۆری جیهانی مرۆڤایەتی لە سایەی دەنگ و وشەکانی ئەواندا هەستیان بەو هەیەجانی ویژدانە کرد کە تا ئەو کاتە نەیانبیستبوو و، شارەزای قووڵایی ناخی خۆیان بوون. بەڵێ، لە سایەی تۆدا ئەو مرۆڤانەی کە وا دیارە زۆر لە یەکتر جیاوازبن و، تەنانەت لە ڕوویەکەوە جیننی و ڕۆحانییەکانیش، لە هەموو ئەو شتانەدا کە هەتا ئەو کاتە نەیانتوانیبوو هەستی پێ بکەن، یان هەستیان پێ کردبوو بەڵام نەیاندەتوانی بیهێننە سەر زمان، یان سەرکەوتووبوون لە وتنیدا بەڵام بە ڕێکوپێکی و تەواوەتی نەیاندەتوانی دەریببڕن، هەموویان پێکەوە هاتنە سەر زار و، زۆرێك لە کێشەکان چارەسەر بوون...

تۆ -کە دڵەکانمان تەختی فەرمانڕەوایەتیتە- لەو ڕۆژەوەی دنیات بە هاتنت شەرەفمەند کردووە، بە ئاشکرا کردنی نهێنیی قووڵی مانا و ماهییەتی مرۆڤ کە بە هێمای "بەڕێزترین و جوانترین بەدیهێنراو"

ئاماژەی بۆ دەکرێت، زنجیری زمانەکانت کردەوە و، ئەدەبی بوون بە بولبولت فێری قەلەباچکەکان کرد و، ئەگەرچی لە چەند گۆشەیەکی جیاوازیشەوە بێت، دۆست و دوژمنت ئاگادار کردەوە لە هەست کردن بە قووڵاییەکانی ناخی خۆیان و دەربڕینی. بەوەی کە کارت بۆ دەرخستنی خاڵە هاوبەشە مرۆییە جیهانییەکان کرد، هەزاران تەفسیر و تێگەیشتنت لە گۆزەیەکدا کۆکردەوە و، لە دەوری ڕۆحێك خڕت کردنەوە و، چەندین شتت لە ئاسۆی دڵی خۆیانەوە دا بە گوێی گشت کەسێکدا. لە سایەی ئەمەدا سەرتاپای مرۆڤایەتی، تەنانەت جنۆکە و ڕۆحانییەکانیش، بە یارمەتی ئەو پوختە و مانایەی کە لە پەیامەکەی تۆوە داچۆڕا، توانییان لە قاڵبی تێگەیشتنە کۆنەکان دەربازببن و، هەموو پێکەوە کەوتنە حاڵەتی گۆڕان و نوێبوونەوە. هەموو کەسێك بە خۆی بزانێت یان نا، زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤایەتی، لە سایەی ئەو سیستەمە ئیمانییەی کە داتمەزراند و ئەو ئامانجە مرۆییانەی کە نیشانت دا، چەندین تازەگەریی ئەنجام دا و، ئیمزای لەسەر چەندین سەرکەوتن دانا.

تا ئەو کاتەی تۆ لە ئاسۆی مرۆڤایەتیدا هەڵهاتیت هەموو شوێنێك تاریك بوو، هەموانیش بەدەست ترسناکیی عەدەمەوە هەڵدەلەرزین و، گیرۆدەی چەند کێشەیەکی کەڵەکەبوو بوون کە چاوەڕێی چارەسەریان دەکرد. بەو پەیامەت کە هەموو کێشەکان چارەسەر دەکات و، وەڵامی گشت پێداویستییەکان دەداتەوە و، بە پێدانی بەڵێنی هاتنەدی سەرجەم هیواکان، خۆشی و ئاسوودەییت خستە نێو دڵانەوە، لەناکاو ڕۆحەکان بە ئومێد شاباڵیان گرت. لەو دڵانەدا کە بەدەست نائومێدییەوە دەیان ناڵاند شنەبای هیوا هەڵیکرد و، نەغمەی دڵنەوایی لە گشت لایەکەوە دەنگی

دایەوە. بەجۆرێك، ئەم بەستە ئەفسووناوییانەی کە لە هەموو جێگایەکدا وەك شەماڵێك هەڵیکردبوو، بە بەردەوامیی پەیمانی بەختەوەریی دەدا بە دڵە خەمبارەکان و، هەمیشە باسی خۆشویستن و خۆشویسترانی بۆ دەکردن و، ئەو پەیوەندییە مرۆییانەی زیندوو دەکردەوە کە کوژابوونەوە و، گڕی عەشق و خۆشەویستیی دادەگیرساند و، ئەو هەستە مرۆییانەی بێدار دەکردەوە کە بۆ ماوەی چەندین سەدە لە سینەکاندا نووستبوون و، ئاراستەی دەکردن بۆ زانینی نرخ و بەهای خۆیان.

هەناسە دڵسۆز و بەسۆزەکانت، ئەو دڵانەی دەبووژاندەوە کە تینووی خۆشەویستی و، هیوا و، بەختەوەریی بووبوون و، جۆش و خرۆشێکی پیرۆزت لەو سینە تینووانەدا دەهێنایە مەیدان کە بە ڕێزەوە پێشوازییان لە پەیامەکەت دەکرد و، پاڵت بە ڕۆحە مەزنەکانەوە دەنا بەرەو وردبوونەوە و قووڵبوونەوە لە بەندایەتیدا و، سەبارەت بەو ژیرییانەش کە بەدوای ڕووناکیدا وێڵ بوون، گەوهەرێکی درەوشاوە بوویت.

تۆ هەمیشە بەو تێکۆشان و، بوێریی و، دامەزراویی و، ئیمانە سەرسوورڕهێنەرەت و بەو هاوەڵە بەوەفایانەش کە شوێنت کەوتبوون، بە توانایەکی سەروو مرۆڤانە، لە خولیای ئەوەدا بوویت کە دەنگت بە هەموو مرۆڤایەتی بگەیەنیت. بەجۆرێك تۆ لە هەموو بەشێکی ژیانی پیرۆزتدا -بە ڕەتکردنەوەی دەستکەوت و دەسەڵاتە شەخسییەکان- هەمیشە بە نییەت و هەوڵی گەیاندنی مرۆڤایەتیی بە بەختەوەریی هەمیشەیی لە هەناسەبڕکێدا بوویت و، هەرگیز وەفا و ڕاستگۆییەکەت بۆ ساتێکیش وەستانی بەخۆوە نەدی. نەتدەتوانی بوەستیت چونکە تۆ بۆ بەدیهێنانی هەموو خەونە مرۆییەکان و، دانانی مانایەك بۆ گشت

هەوڵ و تێکۆشانەکان و، جێبەجێ بوونی ئارەزووی ڕۆحە تینووەکان بۆ ئەبەدییەت، هاتبوویت. پەیمانی جێبەجێ بوونی پێداویستییەکانی دڵ و ڕۆح و لاشە و، هاتنە دی خولیای خۆشویستن و خۆشویستران و، هاتنە دی هیوای بەختەوەربوون لەم دنیا و ئەو دنیاشدا، بەشێکی گرنگی پەیامەکەی تۆی پێکدەهێنا.. وە تۆ پێداگربوویت لەسەر ئەم بابەتانە.

پەیامەکەت جیهانیی بوو، زۆربەی خەڵکی بە ئەندازەی تێگەیشتن لێی و پەیڕەوکردنی، هەستیان دەکرد کە زۆر گونجاوە لەگەڵ هەرێمی تایبەتی دڵیاندا. پەیامەکەت لە ناوەڕۆکدا سروشتیی بوو و، فەرمانە تەشریعییەکانی تەبا بوون لەگەڵ یاسا تەکوینییەکاندا و، لە سایەی گونجانیدا لەگەڵ ژیری و دڵ و ڕۆحدا، هەموو ویژدانێك بە گونجاوی دەبینی لەگەڵ سروشتی خۆیدا و، لە هەرێمی ڕووناکی ئەودا قووڵتر شارەزای نهێنییەکانی "بوون" دەبوون. بەڵێ، هەموو شتێك کە لە تۆوە بیستمان و، لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانتدا خوێندمانەوە، هەرچەندە سەرچاوەکەی زۆر بەرز و پیرۆزە، کەچی لە شێوەی چەند شەپۆلێکدا و لە چوارچێوەیەکدا کە ئێمە بتوانین لێیان تێبگەین و، چێژی لێ وەربگرین و، ڕاڤەی بکەین، هەمیشە ئێمەیان لە باوەش گرت و، دەستیان هێنا بە هەستەکانماندا و، وەك ئەوەی لە هەرێمی دڵماندا گۆش بووبن هەستمان بە نزیکیی کرد لێیانەوە و، وەك ئەوەی لە سنگی ئێمەوە دەرپەڕیبن، هەستمان بە گەرموگوڕییان دەکرد. ماهییەتی مرۆڤانەمانی باوەش کرد و، لە چاوەکانمانی ڕووانی و، سەرتاپامانی بە تام و چێژەکەی سەرمەست کرد. ئەمانە تایبەتمەندییەکانی تۆ بوون و لەم ڕووەوە تۆ بێوێنە بوویت.

بە میتۆدێك کە لە سەرووی سروشتە جیاوازەکان و کلتوورە تایبەتییەکانەوەیە و، دژ و پێچەوانەی هیچ کەسێك نییە و، تەنانەت بە شێوازێکی بەرز و پیرۆز بانگت لە هەموو کەسێك کرد و، ڕۆحە لەبارەکانت خستە ژێر کاریگەریی خۆتەوە و، بە یارمەتی چەند هێما و نیشانە و ئاماژەیەکی تایبەتیی، دەربڕینە سنوورداره‌کانت فراوانتر و قووڵتر کرد و، درزت خستە دەرگای ئەفسووناویی بوونەوەر و ڕووداوەکان بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن و، تەنانەت سەبارەت بە هەندێکیان دەرگاکەت خستە سەر پشت و، خۆشی و شادیی دەست پێ نەگەیشتووی ئەودیوت دەرخواردی دڵە باوەڕدارەکان دا. دیارییە ئاسمانییەکانی تۆ هێشتا مەحرەمییەتی خۆیان لە ڕۆحماندا پاراستووە و، کاتێك بەهۆی چەند ئامێر و شێوازێکی سەردەمەوە و بە شێوەیەکی نوێ هەمان ئەو ڕاستییانە دەردەبڕرێن، جارێکی تر و بارێکی تریش یادی تۆ دەکەینەوە و، لە حزووری پڕشکۆتدا بە لارەملیی ڕادەوەستین. ئەمە مافی تۆیە و، ئەرکی ئەوانەشە کە سینەیان بە هەستی وەفا لێ دەدات.

تۆ دیارییەکی بێوێنە و ناوازەی بەدیهێنەری مەزنیت بۆ سەرجەمی گەردوون و، پەیام و فێرکارییەکانیشت ئەمانەتی ئەون. ئەوانەی کە ئەم نهێنییە دەزانن، هەمیشە تۆیان لە گیانی خۆیان بە ئازیزتر زانی و، هەردەم بە هەستی منەتبارییەوە هەناسەیان هەڵمژی و، لە بەرامبەریشدا پاداشتی ئەم وەفایەیان بە چەندین قات وەرگت.

بەڵام ڕۆژێك هات هەندێك شووم کە کەس نازانێت لە کوێوە هاتوون و منداڵی کام کلتوورەن، دەستیان کرد بە دەربڕینی کوفری ناو دڵیان و، مشتومڕ و قاڵەقاڵ کردن لەگەڵ تۆ. چەندین ناو و ناتۆرەیان

-حاشا- له خۆت و په‌یامه‌كه‌ت نا و، تۆیان له كاتێكی دیاریكراودا زیندانیی كرد و، تا كار هاته سه‌ر ئه‌وه‌ی بێشه‌رمانه وتیان "تایبه‌ت بووه به كات و شوێنێكی دیاریكراو" و، ئازایه‌تییان خسته به‌ر دنیایه‌ك خه‌ڵك كه پڕ بوون له ڕق و قین.. ده‌رگایان كرده‌وه له‌سه‌ر كاریكاتێری بێ ڕێز و وێنه‌ی بێشه‌رمانه‌دا. له‌پڕێكدا و له‌یه‌ك كاتدا تۆ ڕووبه‌ڕووی بێوه‌فایی شوێنكه‌وتووان و هێرشی دوژمنانیش بوویته‌وه. جگه له هه‌وڵ و تێكۆشانی به‌رز و پیرۆزی باووباپیرانمان، ئێمه نه‌مانتوانیبوو تۆ بناسێنین. كاتێك ئه‌مێستا بیر له‌وه ده‌كه‌ینه‌وه كه هه‌وڵی هه‌ڵگیرساندنی كوفر و پێنه‌زانیی ده‌درێت له دنیاكه‌ی تۆدا، خه‌مبار ده‌بین و، له به‌رده‌م خۆمانه‌وه ده‌ڵێین "تومه‌ز ئێمه چه‌ند بێوه‌فا بووین!"

هیچ گومانێكم له‌وه‌دا نییه كه سه‌ره‌ڕای هه‌موو شتێك، دره‌نگ بێت یان زوو، ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ڕه‌گی ڕۆح و مانایان پته‌و و خۆڕاگره و، جینه‌كانیان هه‌ڵگری هه‌مان بێگه‌ردیی و، ئاو و، خاك و، هه‌وای باوباپیرانیانه و، دنیاكه‌یان كراوه‌یه به‌ڕووی سه‌رده‌مێكی گوڵیندا، بێگومان له هه‌رێمی شه‌فه‌قه‌ت و ڕه‌حمه‌تی تۆدا ده‌گه‌ن به زیندووبوونه‌وه‌یه‌كی نوێ. هه‌ر له ئێستاوه هه‌زاران و سه‌دان هه‌زاران به یادی دیدارێكی پیرۆزی له‌م شێوه‌یه‌وه هه‌ناسه هه‌ڵده‌مژن و ده‌یده‌نه‌وه.

نه من و نه كه‌سی تریش ڕووی ئه‌وه‌مان نییه داوای لێبووردن له تۆ بكه‌ین، به‌ڵام هیچ كاتێكیش نه‌كه‌وتووینه‌ته گومانه‌وه له فراوانی كه‌ره‌م و به‌خشنده‌ییت. له‌و حاڵه‌تانه‌شدا كه ئاسۆمان تاریك داهات و، خه‌زان هه‌موو لایه‌كی ته‌نی و، ڕێگاكان وێران و پرده‌كان خاپوور بوون، چاوه‌كانمان هه‌رگیز وازی له شوێنكه‌وتنی جێپێ و شوێنه‌واره‌كانی تۆ

نەهێنا و، هەوڵمان دا وەفا و ڕاستگۆیی خۆمان بهێنینە سەر زار. کەموکورتی و ناتەواوییەکانمان بێسنوورە، بەڵام دیسانیش لە بەرامبەر لێبووردەیی فراوانی تۆدا وەك دڵۆپێك وایە لە دەریادا...

# نامۆبوون

مرۆڤ بە ئەندازەی سەرقاڵ بوونی بە شتێکەوە وردە وردە دەچێتە ژێر کاریگەریی ئەو شتەوە و تیایدا دەخنکێت. بەدرێژایی چەندین سەدە مرۆڤی ئێمە جارێك چووە ژێر کاریگەریی ئامێر[1] و، جارێك هیی پێشکەوتن و تەکنەلۆجیا و، جارێکیش هیی سەرجەم ڕووداوەکانی ڕۆژگار و، ئەوەندە لە خود و ناوەرۆکی خۆی دوور کەوتەوە، بە جارێك بەرامبەر بە دنیای خۆی نامۆ بوو. لەمرۆماندا ئامێر بەجۆرێك بیری مرۆڤی یەخسیر کردووە، مرۆڤی هەژار لەنێو چەرخ و ددان و پێچەکانیدا گیری خواردووە و، یەك لەدوای یەك گەوهەرەکانی چەشنی عەشق و، جۆش و خرۆش و، هەستە مرۆییەکان و، بیرکردنەوە و، ئیرادە و، ویژدانی دۆڕاند.

مرۆڤی مۆدێرنی ئەم سەردەمە بە خۆی و هەست و بیرکردنەوەکانیەوە

١. پێیان وایە مەبەستی نوسەر لە وشەی "ئامێر" لێرەدا بەمانا مارکسیی و کۆمیونیستییەکەیەتی، ئەوەی کە لە فەلسەفەی ماددی مێژوویی کۆمۆنیزمیدا، ئامێرەکانی بەرهەم هێنان بە سەرچاوەی بەختەوەریی خەڵکان و گەلان دادەنرێت.(وەرگێڕ)

لەنێو ددانی جەڕ و پێچەکانی ئامێر و کارگەکاندا ئەنجن ئەنجن بووە. ئەگەر کارەکەی ئەو لە کارگەیەکدا بریتی بێت لە وازهێنان لە دووان و توندکردنەوەی سێهەم برغوو یاخود وازهێنان لە سییان و توند کردنەوەی چوارهەم، ئەو هێندە خۆی سەرقاڵی ئەم کارە بچووکە کردووە و ئەوەندە لەگەڵ پارچەکانی ئامێردا تێکەڵاو بووە، بەم حاڵەیەوە ئەستەمە بتوانێت وەك مرۆڤێکی ئاسایی بیربکاتەوە و، بدوێت و، هەست بکات و، هەڵسوکەوت بکات.

ئەو فەیلەسووفانەی لە ڕابردوودا بایەخیان بە بیرکردنەوە دەدا بە مرۆڤیان دەوت "ئاژەڵی بیرکەرەوە" و، ئەوانەش کە گرنگییان بە گوفتار دەدا ناوی "ئاژەڵی گۆیا"یان بەسەردا بڕیبوو. پێم وایە ئەگەر پێویست بکات ناوێك لە مرۆڤی ئەم سەردەمە بنرێت ئەوا لە هەمووی گونجاوتر "ئاژەڵی برغوو توندکەرەوە" دەبوو. مانای ئەمەش هیچی تر نییە بێجگە لەوەی ئەو ئادەمیزادەی کە بە ئەندازەی گەردوون نرخ و بەهای هەیە، بەقەدەر برغوو و سەمونەیەك بچووك بووەتەوە بایەخ و گرنگیی نەماوە. لەم ڕووەوە وا گونجاوترە پێی بوترێت مرۆڤی یەك ڕەهەند یان مرۆڤی بێ بەها.

بەپێی بیروباوەڕێك کە هەتا ئەم ڕۆژگارەش ماوەتەوە گوایە لە ڕابردوودا هەندێك کەس کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ڕۆحە خراپەکانەوە و، خۆیان لەدەست داوە و، لە ناوەرۆکی خۆیان دوورکەوتوونەتەوە و، گۆڕاون بە چەند داردەست و بووکەڵەیەکی دەستی ڕۆح و شەیتانە شەڕانگێزەکان. دەتوانین هەمان شت سەبارەت بەو ڕۆحە نەخۆشانەی شەیدایانی ڕۆژئاوا بڵێین کە لە بەرامبەری سەروەریی پێشکەوتن و

ته‌كنه‌لۆجیای ڕۆژئاوادا شه‌واره دایگرتوون و، به‌ناوی شارستانێتییه‌وه ڕۆیشتن و هه‌تا قوڕگیان له‌ خراپه‌كانی ئه‌ودا نوقم كرد و، كه‌سایه‌تیی و خود و ناوه‌ڕۆكی خۆیان دۆڕاند. كه‌سانی له‌م جۆره هه‌رگیز وه‌كو خۆیان نابیستن و، وه‌كو خۆیان نابینن و، وه‌كو خۆیان بیرناكه‌نه‌وه و، وه‌كو خۆیان چێژ وه‌رناگرن. هه‌ر بۆیه ماكه گرنگه‌كانی كۆمه‌ڵگا كه به‌درێژایی مێژوو پارێزراون و كۆبوونه‌ته‌وه وه‌ك داب و نه‌ریت و، هه‌ستی ئایینی و، هونه‌ر و، ئه‌ده‌بیات هێدی هێدی سه‌باره‌ت به ئه‌وان ده‌بن به چه‌ند شتێكی ناقۆلا و ناشرین. ئه‌مه له‌كاتێكدا سه‌رجه‌م چێژ و ئازاره‌كان، خۆشی و ناخۆشییه‌كان، ته‌نانه‌ت هه‌موو سه‌ركه‌وتن و نزمبوونه‌وه‌كانی ژیان، پێویسته به‌و تێكه‌ڵه‌یه‌دا كه له سه‌ره‌وه باس كرا وه‌ك ناوێژه‌یه‌ك تێپه‌ڕێنرێت و، ته‌نها به ئه‌ندازه‌ی ئه‌م هه‌ڵسه‌نگاندنه‌ش هه‌ستیان پێ ده‌كه‌ین و، لێیان تێده‌گه‌ین و له‌ناویاندا ده‌ژین. به‌ڵكو به‌پێچه‌وانه‌وه ئه‌م جۆره كه‌سانه ژیان و كاروباره‌كانی ناوی به ئه‌ندازه‌ی كاریگه‌ریی ڕۆڵێك له‌سه‌ر نمایشكارێك كار له‌وان ناكات و هه‌ستی پێ ناكه‌ن.

چه‌ندین ساڵه كۆمه‌ڵگای ڕۆژئاوا شێوازی بیركردنه‌وه و، فه‌لسه‌فه‌ی ژیان و، چێژی تایبه‌ت به خۆی به‌سه‌ر مرۆڤی ئێمه‌دا ده‌سه‌پێنێت و، به جۆرێك سه‌رخۆشی كردووه، چیتر ناتوانێت وه‌ك خۆی بیربكاته‌وه و، وه‌ك خۆی باوه‌ڕبكات و، وه‌ك خۆی بخوێنێته‌وه و بنووسێت. ئه‌و شارستانێتییه شوومه‌ی كه بڕیاربوو كۆمه‌ڵگه‌ی ئێمه دابیمه‌زرێنێت و له پاشماوه‌ی كلتووریی بیست ده‌وڵه‌ته‌وه كۆكرابووه‌وه، وه‌ستانه‌كه‌ی ئازار و ژانه و، جووڵه و بزووتنه‌كه‌شی هه‌زار حه‌سره‌ته..! ئه‌م نه‌ته‌وه هه‌ژاره با هه‌ر وابزانێت كه بووه به خاوه‌نی كلتوور و شارستانێتیی ڕۆژئاوا، وه‌لێ

دنیای بەرامبەر بێجگە لە هێنانەدی تەماع و هەڵپەکانی کە بەدرێژایی چەندین سەدە خەیاڵی بۆ کێشاوە، بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە: دەبوو ئەم کۆمەڵگە هەزارە هەموو شتێکی بگۆڕێت، باوەڕ و، بیرکردنەوە و، کلتوور و، فەلسەفەی ژیان و، بەکارهێنان و، جلوبەرگەکانی و تەنانەت کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکەشی.. ئنجا هەموو ئەمانە لەژێر ناوی فریودەری "شارستانێتیی و بە مۆدێرن کردنی کۆمەڵگا"دا پێشکەش کران و، دوورکەوتنەوە لە خود و نامۆبوون بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر هەموو لایەکی گرتەوە.

ئەگەر پێتان خۆش بێت دەتوانین پێکەوە چاوێك بە پێشەکی کتێبی "لەعنەتەکانی سەر زەوی"ی سارتەردا بخشێنین: ”کۆمەڵێك لاو لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقاوە دەهێنین و، ماوەی چەند مانگێك بە شارەکانی وەك پاریس و ئەمستەردام و لەندەندا دەیانگێڕین و، جلوبەرگیان دەگۆڕین و، پاش ئەوەی تۆزێك زمانی ئێمە فێربوون و کەمێکیش کلتووری ڕۆژئاوایان وەرگرت، لە کلتوور و بەها مەعنەوییەکانی خۆیان دووردەکەونەوە و، ئنجا دەیاننێرینەوە بۆ وڵاتی خۆیان. ئیتر ئەم گەنجانەی کە بوون بە دەنگ و زوڕنای ئێمە لە وڵاتانی خۆیاندا، وەك ئێمە بیردەکەنەوە و وەك بڵندگۆیەك هاوار بۆ ئەو شتانە دەکەن کە ئێمە دەیڵێین...“

چ پێویست بە شێر و ڕێوی و نموونە هێنانەوە دەکات؟! ئەوەی کە خەڵکی ئەم وڵاتە چاولێکەر و شوێنکەوتەی ڕۆژئاوایە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە و لەبەر چاواندایە... دین و کلتوور و مێژوو لەبیری نەوەکان برانەوە و، بە جۆرێك ڕەواج بە "نەبوونی ڕەگ و ڕیشە" درا و بازاڕی گەرم کرا، نەوەی نوێ هیچ لەبارەی کلتووری خۆیەوە نازانێت، کەچی

زۆر لێزان و کارامەیە لە سووکایەتی پێ کردنیدا.. تەواو بێناگایە لە دینەکەی، بەڵام بڕیاری لەپێشینەی داوە و بێ بەزەییانە دەیڕووخێنێت و هێرشی دەکاتە سەر.. لە ئەدەبیات تێناگات و سەری لە پەخشان و هۆنراوە و سەروا دەرناچێت، بەڵام تا بڵێی بوێر و چاونەترس و بێ بەزەییە لە ڕەش کردنی ڕابردووی نەتەوەکەیدا.. تکاتان لێ دەکەم، ئایا دەگونجێت تەسەووری ئەوە بکەین کە ئەم جۆرە کەسانە دەبن بە دەمڕاست و فەرمانڕەوای کۆمەڵگە لە ئاییندەدا و، کەچی موچڕکەی توند بە گیانماندا نەیەت؟ لە کۆمەڵگەیەکدا کە ئەم جۆرە کەسانە ڕێزیان لێ دەگیرێت، دەبێت سەرمان لەوە سووڕنەمێنێت کە گەنجان بووبن بە ئەندامی زیانبەخش بۆ کۆمەڵگا و، ئاژاوە و قەیران و نائارامیی باڵی بەسەردا کێشاوە، بەڵکو دەبێت حەیرانی ئەوە بین کە چۆن هێشتا ئەم هەموو مرۆڤە ماونەتەوە کە وڵات و نیشتمانی خۆیان خۆشدەوێت..!

وەرن لە جیلوەی شیرینی قەدەر بڕوانن کە سەرەڕای ئەم هەموو داڕووخانەی دووچاری نەتەوە بووە، کەچی هێشتا خاك توانای زایین و سەوزکردنی لەدەست نەداوە و، درەختی نەتەوەش سڵاو لە داهاتوو دەکات..!

بەڵێ، لە سەردەمێکدا کە بۆچوونی "تازە هەموو شتێکمان دۆڕاند" زاڵە و، چاوەڕێی ئەوە دەکرا بە تەواوەتی لە مێژوودا ناومان بسڕێتەوە، بەڵام دەبینین هێدی هێدی خۆمان کۆدەکەینەوە و، دێینەوە هۆشی خۆمان و، هەست بەو هەڵانەمان دەکەین کە بەدرێژایی چەندین سەدە کەڵەکە بوون و، ڕۆحی میللی باڵی گرتووە و لەگەڵ ناوەرۆکی ڕاستەقینەی خۆیدا

یەکیگرتووەتەوە.. ئەم ڕووداوە هەم سەیر و سەمەرەیە و، هەم شایانی بەرز نرخاندنە و، هەم پێویستە سوپاسگوزاریشی لەسەر پێشکەش بکرێت.

بەڵام دیسانیش لاسایی کردنەوە ماوەیەکی تریش بەردەوام دەبێت، ڕۆحی میللی هەندێکی تریش دەربەدەرد دەبێت، نەتەوەش کەمێکی تر ئازار دەکێشێت. بەڵام هەموو ئەمانە هەرگیز زۆر ناخایەنێت، دەسڕێنەوە و جێگای خۆیان بۆ ئەو شت و ڕووداوانە جێدەهێڵن کە نەتەوە بیریان دەکات. بە مەرجێك ئەوانەی پەیمانی بەهار و زیندووبوونەوە بە نەتەوە دەدەن خاوەنی قسەی خۆیان بن و، لەم ڕێگا سەختەدا تووشی نائومێدیی و بێزاریی نەبن..!

# چاوەڕوانیی نەوەکان لە پەروەردە و فێرکردن

پێویستە چۆن لە پەروەردە و فێرکردن تێبگەین؟ نەوەکان چۆن و بە چ شێوەیەك پەروەردە بکرێن؟ چ شتێکیان فێربکەین؟ چۆن و بۆچی فێریان بکەین؟ وە کێ هەڵدەستێت بەم ئەرکە پیرۆزە؟

کاتێك باسی بابەتی پەروەردە دەکەین، ناچارین وەڵامی قەناعەت بەخش بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزینەوە.

سیستەمێکی پەروەردە و فێرکردن کە نەتوانراوە ئامانجێکی بۆ دیاری بکرێت، هەروەك نەوەکان دووچاری سەرسووڕمان دەکات، بە هەمان جۆر هەتا نەزانرێت چی فێری نەوەکان دەکرێت و، چۆن پێیان دەوترێتەوە و، ئەو شێواز و میتۆدە چییە کە دەگیرێتە بەر، ئەوا هەموو ئەو شتانەی کە دەخرێنە ناو مێشك و ڕۆحی لاوانەوە، تەنها دەیانکات بە حەماڵی زانیاری.

پەیوەندییەکی بەهێز و نزیکییەکی ڕوون هەیە لە نێوان بونیادی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکان و، ئەو شێواز و بناغەیەی کە لە پەروەردە و

فێرکردندا بەکاردەهێنرێت. تاکەکانی کۆمەڵگا چۆن پەروەردە بکرێن، کۆمەڵگاش وردە وردە ئەو شکڵ و شێوەیە وەردەگرێت. چونکە ئەو نەوانەی ئەمڕۆ پەروەردە دەکرێن، سبەینێ وەکو پەروەردەکارانی ئاییندە دەستبەکار دەبن و، هەمان ئەو شتانەی لە مامۆستایانی خۆیان وەرگرتووە، ڕۆدەکەنە ناو دڵی شاگردەکانیانەوە. هاوسەرگیریی سەبارەت بە بەردەوامیی جەستەیی نەتەوەیەك چەند گرنگ بێت، سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیشیان، پەروەردە بە هەمان شێوە دارای بایەخە. ئەو نەتەوانەی کە بابەتی هاوسەرگیرییان لەسەر چەند بناغەیەکی پتەو دانەمەزراندووە، هەروەك چۆن ناتوانن خۆیان لە داڕووخان بپارێزن، بە هەمان جۆر ئەو نەتەوانەش کە نەیانتوانیوە گرنگیی پێویست بە حاڵەتی ئەخلاقیی و ڕۆحی کۆمەڵگە بدەن، هەرگیز ناتوانن بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەردەوامیی بە بوونیان بدەن.

هەر تاکێکی کۆمەڵگا کەم تا زۆر کاریگەریی لەسەر ئەوانی تر دەبێت و، لەو ڕووەشەوە کە هەندێك شتیش لە کەسانی تر وەردەگرێت، دەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە. هەروەك ئەمە وایە، بە هەمان شێوە داب و نەریت و، چواردەوری دوور و نزیکیش ڕۆڵێکی گرنگیان دەبێت لە پەروەدەبوون و پێگەیشتندا. سەرۆکی خێزان لەناو ئەندامەکانی خێزانەکەیدا و، کاربەدەستانی نەتەوەش لەناو چینە جیاوازەکان و تاکەکانی کۆمەڵگادا خاوەنی دەسەڵات و کاریگەرییەکی بەهێزن. لەم ڕووەوە بەرزبوونەوەی نەتەوەیەك بۆ لوتکەکان بە ئەندازەی توانا و لێهاتنەکانی و، بەجێگەیاندنی ئەرکی سەرشانییەتی بە تەواوەتی و، پەیوەندییەکی نزیکی هەیە بە بیرکردنەوە و، جیهانبینی و، کلتووری

تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە و، هەروەها دڵسۆزی و، نەخشە و، بەسیرەتی کاربەدەستەکانیەوە. چەمینەوەی کاربەدەستان بۆ ئاستی تاکەکان و پاراستنی مافەکانیان و، هەوڵدانی تاکەکانیش بۆ بوون بە چەند بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیی، ئەمە مانای وایە هەم ڕەچاوی دەستووری "هەمووتان شوانن و هەمووشتان بەرپرسن لە ژێردەستەکانتان." کراوە و، هەم یاسای "چێژی ژیاندن لەبری ژیان" کراوە بە سەرمەشقی تەمەن.

ئەوانەی بە پەروەردە کردنی نەوەکانەوە سەرقاڵن، ئەم ئەرکە لەژێر هەر ناو و نیشانێکدا ئەنجام بدەن پێویستە بۆ ساتێکیش مەزنیی و گرنگیی ئەو لێپرسراوێتییەی شانیان داوەتە ژێری لەیاد نەکەن. ئێمە بۆ مسۆگەرکردنی دوارۆژی منداڵەکانمان هەموو ڕێگایەك دەگرینە بەر و، هەموو گریمانێك هەڵدەسەنگێنین و، بۆ ئەوەی ئەوان موحتاجی هیچ شتێك نەبن ڕوویەڕووی ناخۆشترین نارەحەتییەکان دەبینەوە و، بەرگەی هەموو قورساییەك دەگرین و، هەوڵ دەدەین دنیایەکی بەهەشت ئاسایان بۆ ئامادە بکەین. بەڵام داخۆ ئەگەر بە ئەخلاق و فەزیلەت کە سەرمایەی ڕاستەقینەن بەرزمان نەکردبنەوە و، بە تێگەیشتن و کلتووریش نەمانگەیاندبن بە دامەزراویی و ڕاسترەویی، ئایا هەموو هەوڵ و ماندووبوونێکمان بە زایە نەڕۆیشتووە؟..

بەڵێ، گەورەترین سەرمایەی نەتەوەیەك پتەویی ئیرادە و، ئەخلاق و، چاکەکاری و، ئەو کلتوورەیە کە لە باوەشی پەروەردە و فێرکردندا گۆش دەبێت. ئەو نەتەوانەی ئەم سەرمایەیە بەدەست دەهێنن چەکێکیان دەست کەوتووە کە جیهانەکان فەتح دەکات و، کلیلێکی شاراوەیان چنگ کەوتووە کە هەموو گەنجینەکانی دنیا دەکاتەوە. بەپێچەوانەوە، ئەو نەتەوانەش کە

بەرز نەبوونەتەوە بۆ ئاسۆی تێگەیشتن و پەروەردەیەکی لەم شێوەیە، لە پێشبڕکێی ژیانی داهاتوویاندا هەر زوو دەڕووخێن و لەناو دەچن.

ئەگەر مێشکی نەوەکانمان بە زانستەکانی سەردەم و، دڵیان بەو شەماڵانە پڕ بکەین کە لەودیوەوە هەڵدەکەن و، بە یارمەتی ئەو مێژووەی کە دەبێت بە چرایەك لە ڕۆحیاندا، بتوانین وایان لیَ بکەین بە ڕووناکییەکەی ئایندە ببینن، باوەڕ بکەن بچووکترین شت کە لەم پێناوەدا دەیبەخشین بەخۆڕایی ناڕوات! نەك هەر بە خۆڕایی ناڕوات، بەڵکو دەتوانین بڵێین کە لە بەرامبەردا چەندین قاتی وەردەگرینەوە. تەنانەت دەتوانم بڵێم "ئەو دڵە پتەو و، ئەو ڕۆحە پەروەردەبووانە دەبن بە سەرچاوەیەکی دەستکەوتی وا کە تێکڕای نەتەوە گەنجینەیەکی نەبڕاوەی دەست دەکەوێت".

ئەو نەوانەی کە پەروەردەیەکی باشیان وەرگرتووە و پێگەیشتوون، هەر بەربەستێك لە پێشبڕکێی ژیاندا بێتە ڕێیان سنگی دەدەنە بەر و، هەر ناڕەحەتییەکی ماددی و مەعنەوییان تووش ببێت بەسەریدا زاڵ دەبن و، هیچ کاتێك دووچاری نائومێدیی نابن. ئەو چارەڕەشانەش کە لە تێگەیشتنێکی لەم شێوەیە بێ بەشن، هەروەك میراتی ماددیی باب و باپیرانیان دەدەن بە بادا، هەمیشە لە ڕووی ماناوە لە بۆشایی و لەرزیندا دەبن و، ژیانێکی ڕەشبینانە بەڕێ دەکەن، لە کۆتاییشدا لە نێوان ددانە تیژ و پەنجە دڕندەکانی هەرزەیی و بەرەڵاییدا تیادەچن.

ئەمڕۆ کاربەدەستان لە دووڕییانێکدان، یان ئەوەیە نەوەکانی خۆیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاستی مرۆڤایەتی، یان وازیان لێ دەهێنن ببن بە چەند

دێوێکی قەبە، ناچارن بیر لەو بەرپرسیارێتییە گەورەیە بکەنەوە کە لە چیای قاف سەختترە و، لە بەرامبەر ئەو دارمان و ڕووخانە جددییەی کە لە ئەنجامی پشتگوێ خستنی چەندین ساڵەوە سەرچاوەی گرتووە، هەوڵ بۆ دۆزینەوەی چەند ڕێگایەکی مەحکەم و گونجاوی تیمارکردن بدەن. ئەگینا ئەو نەوە بەدبەختانەی کە تا ئەمڕۆ هەزاران جار بەهۆی دارمانە جۆراوجۆرەکانەوە بەنرخترین گەوهەری ژیانیان کەوتووەتە ناو دەریا نەزانراوەکانەوە، بە تەواوەتی هێزی سەوز بوون و زیندووبوونەوە لە دەست دەدەن و، بێ بەرهەم و میوە دەمێننەوە و، جارێکی تر ناگەنەوە بە شکۆمەندییەکانی جارانیان.

# عەشقی زانست و لێکۆڵینەوە

عەشقی زانست و لێکۆڵینەوە بریتییە لە ناونیشانی ئەو جۆش و خرۆش و، چێژە پیرۆزەی مرۆڤ هەستی پێ دەکات کاتێک هەوڵی ناسینی ناوە پیرۆزەکان و، ئەو زاتە دەدات کە لە پشتی ئەو ناوانەوەیە و، ئنجا کە دەیناسێت نزیک دەبێتەوە لێی و، پاشان پەیامگەلێک دەربارەی "ئەو" دەبیستێت لە هەموو شتێکی گیاندار و بێگیاندا. کەسێک هەڵگری شەوقێکی لەم شێوەیە بێت نە تاریکیی شەو دەتوانێت کۆتی بکات، نە بە ژاوەژاو و دەنگەدەنگی ڕۆژیش پەرێشان دەبێت. شەو بە ئاسۆیەکی جیا دەبینێت بۆ تەماشاکردن و، بەرەو ئەو ئامانجە دەڕوات کە هەیەتی، ڕۆژیش وەکو دەرفەتێک هەڵدەسەنگێنێت و، هەمیشە لە چالاکی و جووڵەدایە. ئەو، دەزانێت کە گەیشتن بە حەقیقەت و دەست خستنی چاودێریی خوایی پەیوەستە بە گەشتێکی پڕ لە زەحمەتەوە. زۆر باش دەزانێت ئازار و ناڕەحەتییەکان زاد و توێشوو و هەگبەی ڕێگای پێغەمبەرانە. لە دڵەوە باوەڕی بەوە کردووە کاتێک بە مەبەستی ڕۆشن کردنەوەی سبەینێ و نەوەکانی ئایندە تێدەکۆشێت، دەبێت وەکو مۆم

بتوێتەوە. لە ڕێگای ڕاست خوێندنەوەی "بوون" و ڕاست ڕاڤە کردنی "بوون"دا تەمەنی خۆی دادەنێت.. بە ئومێدی گەیاندنی زانیارییەکانی بە مەعریفەت و، مەعریفەتەکەشی بە یەقین، وەستان و ماندووبوون ناناسێت و، لەم بەیت بۆ ئەو بەیتی شیعری وجود ڕادەکات.

ئەو هەمیشە بەدوای شتانی نوێدا وێڵە. ئاسۆکەی چەندین فەرسەخ لە پێش هەلومەرجی ئێستا و ئامانجی داهاتوویەوەیەتی. خێرایی و بەرزییەکەی زۆر لەوانە بەرزترە کە لە بڵندترین لوتکەکانی ئاسۆدا دەفڕن و، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە سەرمایەکەی بەقەدەر دڵۆپێك دەبێت لە چاوانیدا شکۆی دەریای فراوان دەبینرێت و، باڵەکانی بە ئومێدەوە دەکاتەوە و دایدەخات و، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە خاوەنی فلسێك دەسمایە نییە، بەجۆرێك بەرەو ئامانجەکەی دەڕوات وەك بڵێی هەست بە گەنجینەکانی هەموو دنیا دەکات لەژێر قاچەکانیدا. لەم ڕووەوە هەنووکە ئەو لە هەر حاڵ و بارودۆخێکدا بێت، هیچ گومانێکی نییە سەبارەت بەوەی ئەو ئاڵایەی هەڵیگرتووە سبەینێ لە ئاسمانەکاندا دەشەکێتەوە.

کاتێك هاوچەرخەکانی دوێنێی ئەو لە باوەشی دواکەوتوویی و نەزانیدا دەتلانەوە ئەو هەر وەك خۆی وابوو، بێ وەستان و شەکەت بوون تێڕامانی خۆی ئاڕاستەی ورد و درشتی بوونەوەران و ڕووداوەکان دەکرد، ئیتر با هاوچەرخەکانی هەر لە دوورەوە تەماشای هەموو شتێك بکەن، ئەو هەموو ڕۆژێك بە کۆمەڵێك دۆزینەوەی نوێوە بەرەو ناوەرۆکی بوون و ناوەرۆکی ناوەرۆك دەڕۆیشت. نازانم بۆچی کاتێك سەردەمانێك ئاوا بەم شێوە سەرسووڕهێنەر و سەنجڕاکێشە دەڕۆیشتین لەپڕێکدا وەستاین، بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە ئەمڕۆ ئەوان خۆیان کردووە بە خاوەنی ئەو میراتە

شکۆدارەمان. بەڵێ، ئەم جارەیان ئێمە وەستاین و نۆرەی ڕۆیشتن هاتە سەر ئەوان، ڕۆیشتن و بە سوود وەرگرتن لە بناغەکانی ئێمە ئیمزایان لەسەر چەندین دۆزینەوەی تازە کرد. ئەگەرچی نەگەیشتوون بە ناوەڕۆك و بناغەی هەموو شتێك، بەڵام شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئەوان لە پشتی داهێنانە دەراساکانی زانست و تەکنەلۆجیای ئەم سەردەمەوەن...

لە کاتێکدا ئێمە ڕابردووی دوورمان تابڵێی درەخشانە، کەچی ئێستامان لەوپەڕی هەژاریدایە، لە حاڵێکدا ئەوان وەك ئەوەی بیانەوێت تۆڵە لەو ڕابردووە تاریك و ڕەشەیان بکەنەوە، مەشخەڵی زانستیان بەدەستەوە گرتووە و چەندین فەرسەخ لە پێش ئێمەوەن و، بە پێشکەوتنیان لە بوارەکانی زانست و لێکۆڵینەوەدا -نەك لە بەها مرۆییەکاندا- کەش و فشمان بەسەردا دەکەن. چی بەسەر ئێمەدا هات کە بەم شێوەیە بووین بە پاشکۆی پاشکۆکان.! لەکاتێکدا ئێمە خاوەنی ڕابردوویەکی پتەو و، چەند پاڵنەرێکی بەهێزین کە بۆ هەموو کات و شوێنێك دەخۆن و، شوێنکەوتووانی دینێکین کە زانست و لێکۆڵینەوە بە عیبادەت ئەژمار دەکات، لەم ڕووەوە ئێمە هەرگیز نامۆ نەبووین بە زانستەکان و بوونەوەران و ڕووداوەکان. بەڵام بە هەر هۆکارێك بووبێت یەك جار کەوتینە ناو داوی نەزانی و کۆنەپەرستی و تەمبەڵی و، پاشان قاچمان لەو لاسایی کردنەوە و چاولێکەرییە نەفرەتییە گیرا!..

ئای چ ڕۆژانێك بوون ئەوانە! ئێمە خۆمان بووین و لێکۆڵینەوەکانیشمان خۆمانە بوو. بیرکردنەوە و توێژینەوە و فێرکردنمان بە عیبادەت دەزانی، هەزاران عاشقی زانست لەناو ئێمەدا شەهید بوون کە پڕچەك بوون بە بیرکردنەوەی ئازاد و گەیشتن بە حەق.. لە هەموو بوارێکدا وەك

شانەی هەنگ دەنگمان دەهات و کارمان دەکرد.. لە حاڵێکدا بووین وەك ئەوەی پێشبڕکێ بکەین لەسەر کردنەوەی ئەو پەڕلانەی کە خوای گەورە لە دووتوێی کتێبی بوونەوەراندا دایناون. وەك عاکیفی شاعیر دەڵێت "ڕابردوو دەڵێی خەونێکی ڕووخاوە ئەمێستا."

موسڵمانە سەرەتاکان کاتێك ئیسلامیان بە دنیادا بڵاوکردەوە، لە لایەك بە هەموو هێزیان هەوڵی ڕووناك کردنەوەی دڵانیان دەدا و، ڕێگای ڕزگاربوونیان لە گشت کۆت و پەیوەندێکی ئەو ڕۆژگارە پێش چاو دەخستن و، لە لایەکی تریشەوە دەستیان بگەیشتایەتە هەر کۆمەڵگەیەك تێگەیشتنێکی زانستیی نوێ و، شێوازێکی بیرکردنەوەی نوێ و، میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی تازەیان پێشکەش دەکردن. هێشتا سەدەیەك بەسەر دەرکەوتنی ئیسلامدا تێنەپەڕیبوو کە عاکیف گوتەنی:

"ئەو قاچە پیسانەی سەرەکان هەڵیانگرتبوون گەیشتن بە ئاو،
لاواز کە تەنها مافی چەوسانەوە بوو، هەستایەوە،
زوڵمیش کە زەواڵی بە خەیاڵدا نەهاتبوو، تۆپی..."

بەڵێ، هەر جێگایەك دەنگە بەگوڕەکەی ئەوی پێ گەیشتبێت فیرعەونە گەورە و بچووکەکان تارومار بوون و، ئاڵای حەق و عەدالەت شەکاوەتەوە. کاتێك تەوحید و بەندایەتیی بۆ خوا جێگای بتپەرستیی گرتەوە، چاولێکەریی و ئەفسانەکانیش یەك لەدوای یەك شوێنیان بۆ عەشقی زانست و شەوقی لێکۆڵینەوە چۆڵ کرد.

لەو ڕۆژگارەدا هەموو زانستێك بە زانست ئەژمار دەکرا و بەشی

خۆی لەم عەشق و شەوقە وەردەگرت: لە لایەك زانستەکانی وەك ڕەوانبێژیی، تەفسیر، حەدیس، فیقهـ، ئوسوڵی حەدیس، ئوسوڵی فیقهـ، ئوسوڵی دین دەبوون بە وەرگێڕ و تەرجومانی زمانی سیستەمێکی دینیی نوێ و، فەلسەفەی ژیان و، تێبینییەکان دەربارەی دواڕۆژ -ئێرە شوێنی کردنەوەی ئەو بابەتە نییە- لە هەمان کاتدا بیرکاریی، زانستی ئەندازە، کیمیا، پزیشکیی، گەردووناسیی، کشتوکاڵ، شارداریی... و چەندین زانست و هونەری تریش لە چوارچێوەیەکی جیاوازدا کە هەتا ئەو ڕۆژە نەدەزانران مامەڵەیان لەگەڵدا کرا. سەبارەت بەو ڕۆژگارە دەکرێت ئاماژە بە چەندین بیریار و، فەیلەسووف و، دۆزەرەوە بکرێت کە لە سەرجەم لق و پۆپە جیاوازەکانی زانستەکاندا هەریەکەیان عاشقی لێکۆڵینەوە و تێڕامان بوون: لە ئیمامی (ڕازی)یەوە هەتا (جابیری کوفەیی)، لە (فارابی)یەوە هەتا (ئیبن سینا)، لە (فەزاری)یەوە هەتا (ئەلبەتتانی)، لە (ئیبن یونسەوە) هەتا (زەهراوی)، لە (غەزالی)یەوە هەتا (ئیبن ڕوشد) و سەدانی تریش... ئەمانەی لێرەدا ئاماژەمان بۆ کردن تەنها چەند دانەیەکن لەو زانا و دۆزەرەوە و بیرمەندانەی کە لە زانستەکانی وەك کیمیا، بیرکاریی، زانستیی ئەندازە، پزیشکیی، گەردووناسیی، مۆسیقا، فیقهـ ئوسوڵی فیقهـ تەسەووفدا سیستەمی سەربەخۆی زانستییان داڕشتووە... ئەو بەرهەمانەی ئەم زانایانە هێندە بەرزن کە توانییان چاخ و سەردەمەکان تێپەڕێنن و، ببن بە ڕابەر و ڕێ نیشاندەر بۆ ڕێنیسانسی ڕۆژئاوا. ئەگەر هەندێك نابینای ناو خۆیشمان ئەمە نەبینین، بەڵام لەڕاستیدا جیهانی زانستیی بەویژدان لەسەر ئەم ڕاستییە هاوڕان.

ئێستا ئەگەر مۆڵەتم پێ بدەن حەز دەکەم بابەتەکە بە بۆچوونی کەسانی وەك حەیدەر بەمماد و، جۆسێف بێرتراند و، گوستاڤ لۆ بۆن، زیاتر ڕوون بکەمەوە: سەدەکانی هەشتەم و نۆیەمی زایینی سەبارەت بە موسڵمانان چەند ڕۆژگارێکی ڕووناکن کە تیایاندا چەندین زانست و هونەری جۆراوجۆر سەریان هەڵدا و گەشەیان کرد. مێژووی زانست بەوپەڕی ڕێزەوە باس لە ڕۆژهەڵات دەکات لەم سەردەمانەدا. کاتێك نەزانییەکی ئەستوور و تاریك فەرمانڕەوابوو لە هەموو جێگایەکدا، جیهانی ئیسلامیی لە چاخی زێڕینی خۆیدا دەژیا. زانایان و لێکۆڵەران بە ئەندازەی دەسەڵاتداران ڕێزیان لێ دەگیرا. لە سەردەمی مەئموونی عەبباسیدا بڕیاری سەلماندنی خڕێتیی شێوەی زەوی دەدرێت. ئەم بڕیارە دواتر لە لایەن کوڕانی موساوە (موحەممەد، ئەحمەد، حەسەن) لە بیابانی سەنجاردا هەوڵی تاقیکردنەوەی دەدرێت. ئەم ئەزموونەی کە چۆنێتییەکەی لە مێژووی زانستدا زۆر بەباشی ناسراوە، جارێکی تریش لە بیابانی کوفەدا تاقیدەکرێتەوە و، دەگەن بە کۆمەڵێك ئەنجام کە نزیکە لە زانیارییەکانی ئەم ڕۆژگارەوە.

ئەمە لەکاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێش هاتنی ئیسلام بێجگە لە قوتابخانەی ئەسکەندەرییە، لە زۆرێك لە بوارەکانی زانستدا چەق بەستوویی ڕوویدابوو و، زانستی گەردووناسیش بووبوو بە دیلی دەستی خورافە و ئەفسانە جۆراوجۆرەکان. لێکۆڵینەوەی زانستیی قەتیس مابوو، عەشقی زانست لە خەڵکیدا بە تەواوەتی کوژابووەوە و، بیرکردنەوەی بنیاتنەر لە ساڵانی نامۆیی خۆیدا دەژیا. قوستەنتینییە کە لەو ساڵانەدا بە بەهێزترین ناوەندی زانستیی ئەژمار

دەکرا، سەرقاڵی دیاریکردنی ڕەگەزی ڕۆحەکان بوو. حاڵی ئەورووپاش بە تەواوەتی جەرگبڕ بوو.

لە سەردەمێکی لەم شێوەیەدا موسڵمانانی عاشقی زانست هەموو ئەو زانیارییە پاشماوانەی کە لە میراتی کۆنەوە چنگیان کەوتبوو، بە شەوقێکی قووڵەوە چاویان پێدا دەخشاندەوە و، هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکردەوە و، چەند بۆچوون و یاساگەلێکی نوێشیان بۆ زیاد دەکرد کە نەوەکانی داهاتووی تووشی سەرسووڕمان دەکرد.

هەروەك ئەوە موسڵمانان بوون کە هەر لەدێر زەمانەوە شێوازەکانی ئەزموون و تاقیکردنەوەیان داهێنا، بە هەمان جۆر دۆزینەوەی هەندێك ئامێر یان سیستەم کە تاکو ئێستا لە ئەورووپادا بەکاردێت هەر بەناوی موسڵمانانەوەیە. ئوستورلاب[1] بریتییە لە دیاری ئەلفەزاری بۆ جیهانی زانست، (زیج)[2]یش بریتییە لە بەخششی ئەلبەتتانی کە بەرهەمەکەشی بە هەمان ناوەوەیە، ناوهێنانی جابیری زانا لەگەڵ (جەبر)دا لە جیهانی زانستی بیرکاریدا بە ڕێکەوت نییە، ناوی موحەممەدی بەنو موسا لە زانستی ماتماتیکدا لەگەڵ هاوکێشە پلە دووەکان و ناوی عومەری کوڕی ئیبراهیمیش لەگەڵ هاوکێشە پلە سێکاندا دەهێنرێت، عەلی کوڕی یونسی بەناوبانگ بوو، کە ڕاسترین بۆچوونی لەمەڕ دیاردەی خۆر و مانگ گیرانی خستە گۆڕێ، هەمان ئەم زاتە بۆ یەکەم جار میلی جووڵاوی بەکارهێنا بۆ پێوانەی کات لە کاتژمێردا و دەست نیشانکردنی پێگەی ئەستێرەکان.

---

١. ئوستورلاب: بریتییە لەو ئامێرەی لە کۆندا بەکارهاتووە بۆ پێوانەکردنی بەرزایی و دووری ئەستێرە و هەسارەکان لە زەوییەوە.(وەرگێڕ)

٢. الزیج.

ئەگەرچی لەمڕۆدا ئەم مرۆڤانەی کە بە عاشقی زانست و لێکۆڵینەوە ناسراون لە دنیای ئێمەدا زۆر نازانرێن بەڵام خەڵکانی بە ویژدانی ڕۆژئاوا هەمیشە بەرێزەوە ناویان دەهێنن و، وەك پێشەوایانی زانست یادیان دەکرێتەوە. دان بەوەدا دەنێن کە زانایانی پێشینیان سوودیان لە ئەزموونەکانی لابلاس و، ئیبن یونس و، ئەلبەتتانی وەرگرتووە. جا چۆن وا نەبێت، خۆ جیهانی ڕۆژئاوا بە درێژایی چەندین سەدە سیستەمەکانی ئیبن یونس و ئەلبەتتانی بەکارهێناوە و، لە زانکۆکانیاندا فەلسەفەی ئیبن ڕوشد و زانستی پزیشکییەکەی ڕازی و ئیبن سینایان بە خوێندکارەکانیان وتووەتەوە و، ئامێرەکانی نەشتەرگەریی و شێوازەکانی نەشتەرگەریی تایبەت بە "زەهراوی"یان بەکارهێناوە. لە جیهانی زانستدا کەس نییە ئەلخازین نەناسێت کە هەموو ئەو بیر و بۆچوونە کۆنانەی دەربارەی تونێکاریی چاو هەبوون ڕووخاندی و، لە جێگایاندا کۆمەڵێك بناغە و یاسای پێشنیارکرد کە زۆر نزیکن لە زانستەکانی ئەم ڕۆژگارەوە...

عەشقی زانست و لێکۆڵینەوە لەناو موسڵماناندا تەنها بەم نموونانە و هاوشێوەکانیانەوە بەند نییە، بەڵکو ئەوان هەر لە ئەدەبیاتەوە هەتا جۆرەکانی تری هونەر و، لە کشتوکاڵەوە هەتا باخداری و، لە سیستەمی ئاودێرییەوە هەتا موتوربە کردن، ڕابەر و پێشەوای زۆرێك لەو شتانە بوون کە لە دنیای ئەو سەردەمەدا نەدەزانران. کاتێك دنیا بە ئەفسانەکانی یۆنان دڵی خۆی خۆش دەکرد، ڕۆژهەڵات بە شێوازە ناسك و دەوڵەمەندەکەی ڕۆژئاوای کەمەندکێشی خۆی کردبوو. ڕۆژئاوا، لە ڕێگەی موسڵمانانەوە بەرزیی ئامانج لە هونەردا و، کەشوهەوای ئەفسووناویی "تەجرید"ی ناسی. باخداریی

و زانستی ڕێکخستنی باخچه‌کان و داهێنان تیایاندا، بریتییه له دیاریی جیهانی ئێمه بۆ ڕۆژئاوا. میوه جۆراوجۆره‌کانی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست و وڵاته گه‌رمه‌کانی تر، موسڵمانانی ئه‌نده‌لووس ناساندوویانه به نه‌ته‌وه‌کانی ئه‌وروپا. باخچه‌ی ئاژه‌ڵان و حه‌وزی ماسیش هه‌ر دیاری ئه‌م جۆره که‌س و بیرکردنه‌وانه‌یه بۆ مرۆڤایه‌تی. له‌و ڕۆژگاره‌دا موسڵمانانی ئه‌نده‌لووس هێنده کامڵانه مافی ده‌ستکاری کردنی سروشتیان به‌کارهێنابوو و، باخچه‌ی ئه‌وه‌نده جوان و ڕازاوه‌یان بنیات نابوو، که هه‌ر له بینینی دڕنده‌ترین ئاژه‌ڵه‌وه هه‌تا ناوازه‌ترین باڵنده له‌ناویدا شتێکی ئاسایی بوو. ئه‌وانه‌ی که له شێوازی ڕێکخستن و ده‌وڵه‌مه‌ندییه‌که‌یان ده‌ڕوانی و، گوێیان له ده‌نگ و هاژه‌ی ئه‌فسووناویی تاڤگه‌کانی ده‌بوو، له خۆشیدا له هۆشی خۆیان ده‌چوون.

موسڵمانه پێشینه‌کان به یارمه‌تی ئاسۆی زانست و، عه‌شقی حه‌قیقه‌ت و، خولیای لێکۆڵینه‌وه هه‌موو سووچ و قوژبنێکی بوونه‌وه‌ران و ڕووداوه‌کانیان توێ توێ کرد و، چه‌ند دۆزینه‌وه و داهێنانێکی گرنگیان ئه‌نجامدا که به‌درێژایی چه‌رخه‌کان وه‌کو سه‌رچاوه‌یه‌ك خه‌ڵکی ده‌گه‌ڕانه‌وه بۆیان و، بچوونایه‌ته هه‌ر جێگایه‌ك به‌گوێره‌ی زه‌وقی فراوانی خۆیان سه‌رله‌نوێ ڕێکیان ده‌خسته‌وه و، ده‌یانچوواند به هۆڵی چاوه‌ڕوانیی به‌هه‌شت. هه‌موان ئێره‌ییان به ئه‌وان و دنیاکه‌یان ده‌برد، ئه‌وانه‌ی ڕق و نه‌فره‌ت له دڵیاندا نه‌بوو خۆبه‌خشانه و به پرتاو خۆیان ڕاده‌ستی ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وان ده‌کرد. ئه‌گینا هه‌رگیز ته‌نها به هێزی بازوو نه‌ده‌کرا ئه‌و ماوه دوور و درێژه به‌ره‌نگاری ئه‌و سه‌نگه‌ره فراوانه‌ی دوژمنایه‌تیی ببنه‌وه و خۆیان به‌پێوه ڕابگرن.

وردە وردە تا لەم ڕۆژگارەی خۆمان نزیك ببینەوە ئەم عەشق و شەوقە بەرەو کوژانەوە دەچێت. ئەو چالاکی و زریانی تێڕامانەی کە لە زیهنەکاندا ڕوویان دەدا نیشتەوە و هەموو شتێك پێچەوانە بووەوە.. وە ئەم نەتەوەیە ماندووبوونێکی بکوژ باڵی بەسەردا کێشا. نەتەوە دواکەوتوو و نەزانەکانی دوێنێ بە ئاستی زانستیی و، جددییەتی لێکۆڵینەوە و، پێشکەوتنی ماددی و، دەستکەوتە تەکنەلۆجییەکانیان ئێمەیان خستە ژێر کاریگەریی و دەسەڵاتی خۆیانەوە. داخۆ ئەوان چۆن گەیشتن بەم پێشکەوتنەی ئێستایان؟. بە چ ڕێگایەك ئەم هێزە ترسناکەیان بەدەست هێنا کە بەهۆیەوە بتوانن یاری بە دنیا بکەن؟! بەڕای من ئەم پرسیارانە وەڵامێکی قەدبڕیان هەیە: بە ڕۆیشتنیان بە هەمان ئەو ڕێگایەدا کە ئێمە دوێنێ پیایدا ڕۆیشتین..!

لەم ڕووەوە ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانی ئێمە و فێرکاران بریتییە لە سەرلەنوێ بێدارکردنەوەی ئەو عەشقی زانست و حەقیقەتەی کە لە پێشینانماندا هەبوو و، پاشان هاندانیان بۆ هەوڵ و کۆشش لە ڕێگای زانست و تێڕاماندا. بەڵام ئەوەش ڕاستییە کە بۆ بەجێهێنانی کارێکی مەزنی لەم جۆرە لەم جوگرافیا فراوانەدا، پێویستمان بە دەماغی زیندوو و، دڵی خۆبەخش بە حەقیقەت و، ڕۆحی بێ ڕق و قین و، چەند پاڵەوانێك هەیە کە لە بەرامبەر هیچ بەربەست و قەیرانێکدا نالەرزێن و، هیچ بەرژەوەندییەکی کەسیی و، خێزانیی و، سیاسی و، ئابوورییان نییە، پێویستمان بە کۆمەڵێك پاڵەوانی وایە کە لە هەموو حەز و هەڵپە مرۆییەکان دوورن...

# ڕەشبینی و
# چاخی ویژدان

# ڕەشبینیی و چاخی ویژدان

بەدبینیی کە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی لایەنێکی خراپ لە هەموو شتێکدا و دەربڕینی تەفسیری ڕەشبینانە سەبارەت بە هەموو ڕووداوێك، لەوەتەی مرۆڤ هەیە ئەویش هەیە و، هاوشانی ئادەمیزاد هەتا ئەم ڕۆژگارە هاتووە و، نەخۆشییەکی مرۆیی وایە کە چەشنی ئافەتێك هەتا دنیا بمێنێت دەست لە یەخەی ئادەمیزاد هەڵناگرێت. چەندین سەروی ڕەوان، چەندین سوڵتانی گوڵڕوخان، چەندین جیهانگیر و خان، لەنێو پەنجەکانی ئەم نەخۆشییە ستەمکارەدا وەکو گەڵای پاییز هەڵوەریون و، مانەندی دار چناری کلۆر هاتوون بە لادا و، وەکو ئەو تاشەبەردانەی کە بومەلەرزە لێی داون بەم لا و ئەو لادا هەپروون بە هەپروون بوون و، ناویان سڕاوەتەوە. ڕۆیشتووان ڕۆیشتوون، بەڵام وەکو میراتێك ئەم سیفەتەیان بۆ ئەوانەی دوای خۆیان هێشتووەتەوە و، تەنانەت لەمڕۆشدا هەزاران کەس هەن کە ئەم گەشتی مەرگ و کاروانی مردنە هێشتا بەلایانەوە خۆشەویستترین کەرەستەیە.

بەڕای کەسێکی ڕەشبین هەموو کاتێك "بوون" لە دەوری گەرداوی

مەرگدا دەسووڕێتەوە و، دنیا بەرەو نەزانراویی و نەناسراویی کۆچ دەکات و، چینەکانی زەوی لەسەر چەند پلێتێکی خلیسك وەستاون و هەموو ساتێك ترس دەخەنە نێو دڵانەوە و، مرۆڤەکان بۆ گرتن و خواردنی یەکتر هەمیشە لە کەمیندان و، ڕۆژان بە تێپەڕبوونی کات پتر تاریك دادێن و، هەموو شتێك لەناو هەرەمەکێتی و بەربادیدا لەدایك دەبێت و، لەناو هەمان شتیشدا ئاوا دەبێت. بەڵێ، بەڕای ئەو دەگونجێت هەموو ساتێك گەردوون سەرەوژێر ببێت.. زەوی بە بوومەلەرزەکان کون کون ببێت، گوند و شار و شارۆچکەکان ببن بە چەند گۆڕستانێکی زەبەلاح کە تەرمی دانیشتووانیان لەخۆگرتووە.. چینەکانی کۆمەڵگە هێندەی تر لەیەکتر دوور دەکەونەوە و دەترازێن، لەوانەیە زۆربەی بەهاکان ئاوەژوو ببنەوە.. ئەو شەڕ و، جەنگ و، کودەتا و، شۆڕش و، کارەساتانەی کە لە چەند ساڵی داهاتوودا ڕوودەدەن، لەوانەیە ببن بە هۆکاری کۆتایی هێنان بە جیهان و، شارستانێتییەکان و، نەتەوەکان.. بەڵێ، بەدبین هەموو شتێك بەم شێوەیە دەبینێت و، دەبیستێت و، ڕاڤەی دەکات و، هاوڕێ لەگەڵ هاوار و ناڵە هەتیوانەکەیدا سەر و قژی خۆی دەڕنێت.. چاخەکانی پێشین بە خۆیان و هەزار و یەك ناخۆشی و کارەساتەکانیانەوە و، جەنگی نەوەد و سێ[1] و، جەنگی بەڵقان و، جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم و، ئاڵۆزییە ناوخۆییەکانی ڕوسیا و، ناسەقامگیری و شۆڕشەکانی ئەورووپا.. ئەمانە و سەرجەم کارەساتەکانی تری هاوچەشنیان سەبارەت بە ڕۆحە نەخۆش و ڕەشبینەکان هەمیشە بە سەرەتای کۆتایی و نیشانەکانی قیامەت لە قەڵەم دراون.

١. مەبەست لە جەنگی نێوان عوسمانی و چاری ڕوسیایە لە ساڵی (١٩٦٦)ی زایینی کە دەکاتە (١٢٩٣)ی کۆچی. (وەرگێڕ)

له‌ڕاستیدا ئه‌ژمار كردنی هه‌موو جه‌نگ و، شۆڕش و، ئاڵوگۆڕه‌كان به‌ چه‌ند ڕووداوێكی نه‌رێنیی و خراپی ڕه‌ها -وه‌كو ئه‌وه‌ی ئه‌وان گومان ده‌به‌ن- بڕیارێكی ڕاست نییه‌.. ئه‌م ڕووداوانه‌ نه‌ك هه‌ر به‌ نه‌رێنیی و خراپ حساب ناكرێن، به‌ڵكو زۆر جار به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه‌ پاڵنه‌ری جه‌نگ و شۆڕشه‌كان ئامانجی مرۆییانه‌ بووه‌ و، شۆڕشگێڕ و جه‌نگاوه‌ره‌كانیش خاوه‌نی نییه‌تێكی باش بوون، چه‌ندین ئه‌نجامی ئه‌رێنیی نائاسایی و ده‌راساشیان لێ كه‌وتووه‌ته‌وه‌. به‌تایبه‌ت ئه‌گه‌ر ئه‌و ئاڵوگۆڕانه‌ ئامانجیان ده‌رخستنی باشی و جوانی و ڕاستی بێت و، هه‌ڵه‌شه‌ و سته‌مكاران ڕابوه‌ستێنن و ده‌ستدرێژیكاران له‌ناوببه‌ن و، تێگه‌یشتنه‌ كۆن و ڕزیوه‌كان بڕووخێنن و سه‌رله‌نوێ ته‌فسیری شتان و ڕووداوه‌كان بكه‌ن، هیچ گومانێك له‌وه‌دا نییه‌ كه‌ سوودبه‌خشن. سه‌ره‌تا بزووتنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ران و پاشان هه‌موو ئه‌و ئاڵوگۆڕانه‌ی له‌ سه‌ر زه‌ویدا ڕوویانداوه‌، له‌ ڕووی ئه‌نجامه‌وه‌ هه‌میشه‌ به‌ قازانجی مرۆڤایه‌تیی بوون. به‌ڵێ، هه‌رگیز ناگونجێت ئه‌و شۆڕشانه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ران هێنایانه‌ گۆڕێ و، ئه‌و ئاڵوگۆڕ و تازه‌گه‌رییه‌ی كه‌ پێشه‌وایانی ئیسلام سه‌رمه‌شقی بوون، ئه‌و سه‌ره‌وژێر كردنه‌وه‌یه‌ی مێژووش كه‌ پێشینانی پرشنگدارمان پێی هه‌ستان، به‌ ڕووخان و كاولكاریی له‌ قه‌ڵه‌م بده‌ین. پیشاندانی ڕێگاكانی شارستانێتیی به‌ كۆمه‌ڵگه‌یه‌ك كه‌ له‌نێو ده‌شته‌كێتیدا گیری خواردووه‌ و، گۆڕینی مرۆڤه‌ سه‌ره‌تاییه‌ بیابان نشینه‌كان به‌ مامۆستای نه‌ته‌وه‌ پێشكه‌وتووه‌كان، تكاتان لێ ده‌كه‌م، ئایا ئه‌مانه‌ به‌ ڕووخان و كاولكاریی هه‌ژمار ده‌كرێن؟! گرتنی ئه‌سته‌مبوڵ له‌ لایه‌ن سوڵتان موحه‌ممه‌د فاتیحه‌وه‌ و كردنه‌وه‌ی ڕێگایه‌ك بۆ ڕێنیسانس له‌بری هزری كۆن و

ڕزیوی بێژەنتیی، دەتوانین بە ڕووخان و کاولکاریی حسابی بکەین؟ کاتێك تاریق ڕۆحێك و مانایەکی نوێی برد بۆ ئەندەلووس، هەرچەندە وەکو قیامەتێکی کاتیی وابوو بۆ ئیسپانیای ئەو کاتە، بەڵام لە بنەڕەتدا ئەم جووڵەیە لە هەموو ئەوروپادا بوو بە قیامەتێك کە "زیندووبوونەوە"ی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەگەر ئاڵپئەرسلان لە مالازگیرت ڕێگاکانی بەرەو قوستەنتینییە واڵا نەکردایە، هزری زانستیی ڕۆژهەڵات و، ئەخلاقی زانستی و، هونەرەکەی چۆن گەیشتبان بە ڕۆژئاوا؟

ئیدی با هەر بیری لارولوێری بێباوەڕیی بزووتنەوەی یەکتاپەرستیی بە کاولکاریی بزانێت، بتپەرستیی باوەڕهێنان بە حەقیقەتە ڕووت و موجەڕڕەدەکان بە داڕووخان بزانێت و، ئەوانەی سنگەخشێ کردن بە ڕۆیشتن دەزانن هەر لەسەر وتنی "حاڵی جاران و دیکۆری جاران" بەردەوام بن، ئێمە باوەڕمان وایە کە هەموو ئەمانە تازەبوونەوە و، نوێ بوونەوە و، کرانەوەن بەڕووی هەتاهەتاییدا. ئەوەندە هەیە چونکە دنیا لە بناغە و هەوێنیدا لەپاڵ خێردا شەڕ و، لەپاڵ چاکدا خراپ و، لە تەنیشت جواندا ناشرین و، لەگەڵ سووددا زیانیش لەخۆ دەگرێت، جاری وایە لەو جوانی و، گونجاویی و، حەقانییەتەی کە لە ڕۆحی شتان و ڕووداوەکاندا هەیە، زیاتر ئەو خراپییانە سەرنجەکان ڕادەکێشن کە ئەوانیش بەرهەمی ئیرادەی ئازادی مرۆڤن و، وەکو چەند شەڕێك دەردەکەون کە دەرگا لەسەر چەندین خێر دەخەنە سەر پشت.

لەم ڕووەوە ئەگەر هەندێك لە جەنگ و شۆڕشەکان، بە پرۆسەی لابردن و گۆڕینی -هەرچەندە ڕووی دەرەوەی ئەم ئاڵوگۆڕانە ترسناك دیارن- هەندێك لەو بیرکردنەوە و سیستەمە کۆن و ڕزیوانە دابنرێت کە

پیر بوون و، هێزیان نەماوە و، چیتر توانای بەرهەم هێنان و خزمەت کردنیان نییە، ئەوا ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە زیاتر لە جێی خۆیدایەتی. ئەم پرۆسە پێویستەی پاڵفتە کردن و ئاڵوگۆڕ، ئەگەر ترسیش بخاتە دڵی هەندێك ڕۆحی ناشرین و نەخۆشەوە، ئەوا دەکرێت بە هۆکارێکی پڕچەکبوونی توانا و لێهاتنەکان دابنرێن سەبارەت بەوانەی کە ناخیان پڕە لە ژیان و وزە و، هەمیشە دمیانگەیەنێت بە کۆمەڵێك ئاسۆی نوێ.

لەڕاستیدا سەرلەبەری مێژووی مرۆڤایەتیی بریتییە لە گۆڕان و نوێبوونەوە. لە دروستبوون و پێکهاتنە مێژووییەکاندا، زۆرێك لەو کۆمەڵگە و نەتەوانەی کە نەیانتوانیوە "ئێستا" لەباوەش بگرن و کراوەش نەبوون بەڕووی داهاتوودا، لەم ئاڵوگۆڕانەدا مەحکووم بوون بە هەڵوەرین و لەناوچوون. لە بەرامبەر ئەمەشەوە، قارەمانانی "ئێستا" و ئەندازیارانی فیکر لە "داهاتوو"دا هەموو کاتێك ئەم ڕێگا پڕ لە هەوراز و نشێوەیان بەوپەڕی ئاسانییەوە بڕیوە و، گەیشتوون بە مەیدانی فراوانی "ئاییندە" و، لەمەولاش هەر پێی دەگەن.

دەست پێکردنی گۆڕان و نوێبوونەوەیەکی لەم جۆرە لە لایەن حەزرەتی موسا و شوعەیبەوە لە هەموو فەلەستینی کۆن و شەریعادا و، تێپەڕاندنی فەلەستین و ئەفەس لە لایەن حەوارییەکانی حەزرەتی عیسا و، پەڕینەوەیان بۆ ڕۆما و، ڕووخاندنی بناغەکانی ڕۆمای کۆن و، موجاهیدە یەکەمینەکانی ئیسلام کە بوون بە هاوارێك و ترسیان خستە دڵی هەموو ئەوانەوە کە خاوەنی "خاڵی پشت پێ بەستن" نەبوون، هەموو ئەم ڕووداوانە لەڕووی ئەنجامەکانیانەوە کاریگەریی لافاوێك و شنەبایەکی بەهارانەیان هەبووە لەسەر ئەو جێگایانەی کە بۆی چوون.

بەڵێ، ئەگەر لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە ڕوویان تێکردووە ئەو شتانەی پێویست بوو بڕووخێن دارمابن و، لە جێگای بیرکردنەوە کۆنەکان سیستەم و هزری تازەتر و زیندووتر جێگیر کرابن، کەواتە ئەمانە چەند جووڵەیەکی بنیاتنانن نەك کاولکاریی.

لەوەتەی هەیە ڕواڵەت بینەکان سەبارەت بە هەندێك لەو ڕووداوانەی کە نەرێنیی دەردەکەون، هەمیشە وەکو شتێکی ڕەش بینیویانە و، ڕەشبینانە ڕاڤەیان کردووە و، بە چەند تێبینییەکی ڕەش و تاریکەوە هێناویانەتە سەر زمان. کەچی ئەو ڕووداوانەی ئەوان بە ڕەش و تاریکیان دەزانین، ئەمێستا لە سینەیاندا بەهار گۆش دەکەن.. ڕووداوەکان وەك ئەو بەفر و سەهۆڵەی کە هەموو لایەك دادەپۆشن، بەستەی ژیانەوە و زیندووبوونەوەیەکی گشتیی لەژێر لێوەوە دەدرکێنن.. ئەو هەڵەشەییە بەربڵاو و، ئەو قەیران و پێکدادانەی کە هەموو کاتێك لەسەر زەویدا و لەناو چینەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤدا دەیبینین، لە قووڵایی ناو ڕۆحەکان و لە چینەکانی ژیری و بیرکردنەوەدا، بیری ئاشتی و ئاسایشێکی جیهانیی دەهێننە مەیدان و، وەك بڵێی هەموو شتێك هاتنی دنیای ناو خولیا و خۆزگەکانمان خێراتر دەکات.

لەڕاستیدا هەموو ئاڵوگۆڕێك -بە مەرجێك بناغە و دینامیکە بنەڕەتییەکانی ئایین و نەتەوە بپارێزێت- دوژمنی شارستانێتیی و نەتەوە نییە. بەپێچەوانەوە -دیسان مەرجەکەی سەرەوە یاد دەخەینەوە- هەموو ئاڵوگۆڕ و ڕووداوێکی مەزن، بە ئەندازەی گەورەیی و گشتگیرییەکەی، هەریەکەیان جووڵەیەکی زۆر گرنگن و دەرگا لەسەر سیستەمی بیرکردنەوەی نوێ و شارستانێتیی تازە واڵا دەکەن. هەر لەبەر ئەم

خاسیەتی یەکتر پەروەردە کردن و یارمەتیدانی یەکترمیە کە ئەم دوو پێکهاتەیە بێ ئەوەی یەکتری تەواو بکەن و، یەکێکیان ئەوی تریان لەناو ببات، تا ئەم ڕۆژگارەمان هاتوون. لەمەو دواش پێدەچێت هەر بەردەوام بێت. ئەوانەی کە بەگوێرەی دیوی دەرەوەی ناشرینی هەندێك لە ڕووداوەکان ڕاڤەی مێژوو دەکەن و لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکەن، هەتا ئەو کاتەی لەو بۆگەناوەی تێی کەوتوون و وەهمیانی پیس کردووە نەیەنە دەرەوە، لە ڕەشبینیی ڕزگاریان نابێت و، بەو وەهمانەشیان کە گوایا تەفسیری ڕووداوە مێژووییەکانی پێ دەکەن، بیرکردنەوەی چەندین کەسی تریش لێڵ دەکەن. ئەوان با هەر لە هەڵەی خۆیاندا بگەوزێن، وەلێ شەوان ڕۆژیان بەدوادا دێت.. بەفر و باران و بۆران لە سنگیاندا بەهار پەروەردە دەکەن.. وە "لەناو ئاڵوگۆڕەکانی ئاییندەدا بەرزترین و بەگوڕترین دەنگ سەدای (حەق) دەبێت."[١]

بەڵێ، پێویستە جارێکی تریش ئەوە یاد بخەینەوە کە هەروەك تا ئێستا جەنگ و شەڕەکان بەردەوام بوون، لەمەو دواش بە تەواوەتی لەناوناچن، بەڵام هیچ نەبێت لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا کەم دەبنەوە.. ئاشتیی جیهانیی نێو خەیاڵەکانمان نایەتە دی، بەڵام لەچاو ئێستادا زیاتر پەرە دەسێنێت.. لێرە و لەوێ زریانی شۆڕش و دووبەرەکییەکان ئەندێشەکانمان دەلەرزێنێت، وەلێ لەوانەیە مرۆڤانەتر ڕووبدەن..

بەکورتی، لێرەش بەدواوە "کات" تەفسیری خۆی دەخاتە مەیدان و هەموو کەسێکیش بەردەوام دەبێت لە وەرگرتنی بەشی خۆی لێی.. لە دنیای بچووك بووەوە و تەسك بووەوەی داهاتوودا، پەیوەندیی نێوان

---

١. ئەم وتەیە هی زانای گەورەی کورد (سەعیدی نوورسی)یە. (وەرگێڕ)

کۆمەڵگە و نەتەوەکان بەگوێرەی کۆمەڵە سەرچاوە و پرەنسیپێکی سەردەم دەبێت.. پێشکەوتنی زانست و، لۆجیك و، بڕیاردان و، دادگایی و، ئیلهام، تەنانەت گەرداوی ئاڵوگۆڕە هەرە مەزن و ترسناکەکانیش نەرم و هێور دەکاتەوە و، سنووری شتە مرۆییەکان دەپارێزێت و، ڕۆژگارەکەمان دەکات بە چاخی ویژدان.

# هێزی نەدۆڕاوی
# دین

# هێزی نەدۆڕاوی دین

دنیا چەند بگۆڕێت و چ حاڵەتێك وەربگرێت، زانست و هونەر چەند پێش بکەون، تێگەیشتن و جیهانبینیی ئادەمیزاد چەند گۆڕانی بەسەردا بێت، هێشتا هەستی ئایینیی هەروەك بەدرێژایی مێژوو لە دامەزرانی ژیانی زانستیی و فیکریدا و، لە لەدایکبوون و گەورەبوونی شارستانێتییە نوێیەکاندا و، لە کامڵبوونی مرۆڤایەتیدا یەکەم هۆکار و فاکتەر بووە، ئەمڕۆش هێشتا بە هێزە ئەفسووناوییەکەی لە بەشێکی زۆری ئەم دنیایەدا وەکو یەکەمین هۆکار بەردەوامیی بە کاریگەریی خۆی دەدات و، گرەویش لەسەر هەمان کاریگەریی دەکات لە داهاتوودا. دوو گەورەترین شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە یەکێکیان هی موسڵمانەکانە و ئەوی تریان هی مەسیحییەکانە، ئەمەش زیندووترین و بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر قسەکانمان.

هەرچەندە هەندێك لە شەیدایانی ڕۆژئاوای ناو ئێمە خۆیان لە گێلی بدەن و نەیانەوێت ببینن، بەڵام خەڵکی ڕۆژئاوا بەجۆرێك ڕێز لە سەرچاوەی شارستانێتیی و کلتووری ئەمڕۆیان دەگرن و، لەم ڕووەوە

هێندە نرخشناسن کە ئێمە دووچاری شەرم دەکەن. بەڵێ، ئەوان لە لایەك بە حیزب و فەرمانڕەواکانیان کە خاوەنی ڕەهەندی ئینجیلین، هەوڵی دانەوەی قەرزی وەفای ئەستۆیان دەدەن بەرامبەر بە گرنگترین کۆڵەکەی کلتوورەکەیان و، لە لایەکی تریشەوە بڵاوکردنەوەی پەیامی ڕزگاریی و نومێد بەناوی حەزرەتی مەسیحەوە بە هەموو دنیادا فەرامۆش ناکەن و، تەنانەت لەم بابەتەدا خەباتێکی حەوارییانە پێشکەش دەکەن.

هەر بۆیە دەکرێت بوترێت کە دین هەموو ڕۆژێك کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر جیهانی شارستانیی ئەم ڕۆژگارە زیاتر دەکات و، وەکو ڕابردوو، لە داهاتووشدا ڕۆڵی تایبەتی خۆی دەگێڕێت. هەر لە ئێستاوە کەنیسەی ئۆرتۆدۆکس پاش ژیانێکی چەندین ساڵەی دیل ئاسا لەژێر سایەی کۆمیونیزمدا، وەك ئەوەی هیچ شتێك لە هێزەکەی کەمی نەکردبێت، بە هێز و ورەیەکی نوێوە خۆی کۆکردووەتەوە و، یەك یەك هەموو ئەو دامەزراوە گرنگانەی کە تا دوێنێ لە بەرامبەر کۆمیونیزمدا لە دەستی دابوو، ئەمڕۆ وەریاندەگرێتەوە.. سەرهەڵدانی یەك لەدوای یەکی حیزبگەلێك لە وڵاتانی ئەورووپادا کە خاوەنی جیهانبینیی ئایینین و، تەنانەت سەرکەوتنیان بۆ دەسەڵات لە هەندێك جێگادا.. هەروەها ئەوەی کە هێشتا لە زۆربەی زۆری وڵاتانی ڕۆژئاوادا سوێند بە ئینجیل دەخورێت، -با ئەمە بچێت بە چاوی کوێر و گوێی کەڕی کۆنەپەرستە مولحیدەکاندا!- لە سەرجەم دامەزراوەکانی پەروەردە و فێرکردندا پێگەیەکی فراوان بە پەروەردەی ئایینیی دەدرێت و، بەڕێوەبردنی ئەم کارەش بە پلان و پرۆگرامێکی جددی.. کراوەبوونی تەواوەتیی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان بەڕووی بانگەوازی ئایینیدا.. ئەم خاڵانەی لە سەرەوە باسمان کرد نەك

بۆ دینێك كه به پاكی و ڕوونیی ئه‌سڵیی خۆیه‌وه به‌پێوه وه‌ستابێت، به‌ڵكو ته‌نانه‌ت بۆ هێزێكی ترسناكیش كه ته‌نها له سێبه‌ری دینێكدا جێیه‌كی بچووكی بۆ خۆی كردبێته‌وه، ده‌بێت به سه‌رچاوه‌ی هێزێكی وا بۆی كه به ئاسانی نه‌دۆڕێت و نه‌ڕووخێت..!

جگه له‌وه‌ش تا دوێنێ پارێزه‌رانی دین ته‌نها له‌ناو زانایانی ئایینییه‌وه ده‌رده‌چوو، به‌ڵام ئه‌مڕۆ چه‌ندین زانا له بواره جیاوازه‌كانی وه‌ك زینده‌وه‌رناسیی و، كارئه‌ندامناسیی و، مرۆڤناسیی و، پزیشكیی و، بیركاری و، فیزیا و، كیمیا و، ده‌روونناسیی و، كۆمه‌ڵناسیی و چه‌ندانی تریش هاتوونه‌ته ڕیزی پارێزگاران له ئایین و، ئه‌مریی حه‌قیقه‌تی دین ئاشكرا ده‌كه‌ن.

هێشتا له‌ناو ئێمه‌دا هه‌ندێك به‌ناوی "ئه‌زموونگه‌ریی"ه‌وه به‌رگریی له مادده‌په‌رستیی ده‌كه‌ن و، كاتێكیش ئه‌مه ده‌كه‌ن قاچیان له یوتۆپیای كۆن و پووچی كۆمیونیزم -كه مۆده‌ی به‌سه‌رچووه- گیر ده‌بێت! ئای ئه‌م تابلۆیه چه‌ند خه‌مگین و، تاڵ و، چه‌ند شه‌رم ئاوه‌ریشه! سوپاس بۆ خوا چونكه پڕوپاگه‌نده‌كانی ئه‌مانه زۆر بێعه‌قڵانه‌یه و، ته‌نها له ئاستی خه‌ڵه‌تاندنی منداڵاندایه، هه‌رگیز ناتوانن بگه‌ن به‌و ئامانجه‌ی ده‌ستنیشانیان كردووه و، كاتێك به‌ر ژیری و، فیراسه‌ت و، به‌سیره‌تی خه‌ڵكانی تێگه‌یشتوو ده‌كه‌وێت، ورد و خاش ده‌بێت. له‌به‌ر ئه‌وه به‌راورد به ساڵانی بێناگایی دنیا، كاریگه‌رییان زیاتر خۆجێییه و، هه‌موو ڕۆژێكیش ئه‌م كاریگه‌ریه‌یان پتر بچووك و كه‌م ده‌بێته‌وه.

به‌ڵێ، ئه‌و كه‌سانه‌ی له‌م ڕۆژگاره‌دا كه‌مێك بخوێننه‌وه و تێبگه‌ن و،

بە تێگەیشتنیشیان بگەن بە چەند پێکهاتەیەکی فیکریی نوێ. دەزانن کە زانستە ئەزموونییەکان هەموو شتێك نین و، بەپێچەوانەوە، لە دەرەوەی چوارچێوە تەسك و یەك ڕەهەندییەکەی ئەودا، دنیایەك زانست هەیە کە لە ژێری و، ڕۆح و، ویژدان و، ئیلهامەوە سەرچاوەیان گرتووە و، تێدەگەن کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا جاری وا هەبووە یەکێك لەمانە یان چەند دانەیەکیان، شوێنەواری قووڵ و نەسڕاوەیان بەجێهێشتووە و، زانستە ئەزموونییەکان لەچاو ئەمانەدا وەکو دڵۆپێك وان لە دەریادا.

ماوەتەوە بڵێین وتنی ئەوەی کە زانستە ئەزموونییەکان لە ژیانی مرۆڤدا خاوەنی ئامانجێکی ئەخلاقین، تا بڵێی سەخت و گرانە. چونکە تاقە ئامانجی ئەوان بریتییە لە شیکردنەوە و ناسینی ماددە و ئەوپەڕی سوود وەرگرتن لێی. فیزیای ناوکیی و کارلێکە کیمیاییەکان لێپرسراو نین لەو ئەنجامە ئەخلاقییانەی کە بەرهەمی دەهێنن. هەر بۆیە هەتا ئەمانە لە دەستی ئیماندار و ئەمیندا نەبن، ئەو تۆز و غوبارەی کە هێرۆشیما و ناکازاکی و چەندین شوێنی تریشی گرتەوە، هەرِەشە لە شوێنانی دیکە دەکەن و دەبن بە سەرچاوەی ترس و تۆقاندن...

بۆمبی ئەتۆمیی و هایدرۆجینیی و چەندین بەرهەمی زانستیی تریش هەن کە باشێتی و سوودبەخشییان، یاخود خراپێتی و زیانبەخشییان، بە گوێرەی ئەو دەستانە دەگۆڕێت کە خاوەنیانن.. ئەو مرۆڤانەی کە خاوەنی ڕۆح و ویژدانێکی پاکن و، هەموو چرکەساتێکی ژیانیان لە سایەی ئەو شەماڵانەدا بەڕێ دەکەن کە لەودیوەوە هەڵدەکات و، لە هەناسەکانیاندا چاکەکاریی هەڵدەمژن.. بەڵێ، مەترسیدارترین چەك و تەقەمەنییەکان لە دەستی ئەم جۆرە کەسانەدا وەکو دارستانەکان ترسناك، بەڵام چەشنی

درەختەکان لە ڕۆحەوە نزیکن و، چەشنی ڕووبارەکان بەجۆش، وەلێ وەك دەنگی ئاو ئاسوودەیی دەبەخشن بە دڵەکان.. کاتێك بێدەنگن بەزەییان لێ دەبارێت، بەڵام کاتێکیش دەنەڕێنن خراپکاران چاوترسێن دەکەن و لە سنووری خۆیاندا ڕایاندەگرن.. بەڵێ، لە هەمان ئەو کاتەدا کە ترس و لەرز دەخەنە دڵی ستەمکاران و دەستدرێژیکارانەوە، وەکو شنەبایەك بەسەر دڵی هەموو ستەملێکراوان و مافخوراواندا هەڵدەکەن.

خۆی لە خۆیدا هەموو بیریارە مەزنەکانی جیهان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون کە زانیارییە ڕەها و پەتییەکان شتێکی وا زۆریان پێ نییە پێشکەشی ئادەمیزادی بکەن، ئەو نرخە گوێرەییەی کە تێیدایە تەنها ئەو کاتە دەتوانرێت دەربهێنرێت و بەکەڵك بێت کە لە لایەن کەسانێکی خاوەن ئەخلاق و فەزیلەتەوە نوێنەرایەتیی بکرێن. ئەنیشتاین دەڵێت "زانست نیشانمان دەدات ڕووداوەکان چ جۆرە پەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە و، لە هەلومەرجە تایبەتییەکانی خۆیاندا چۆن هاتوونەتە بوون، بەڵام ئەم زانیارییەی کە هیی "هەبوو"ەکانە، فێرمان ناکات پێویستە چۆن بن." بە ڕای ئەو، ئەو شتەی کە پێمان دەڵێت پێویستە زانست و مرۆڤ چۆن بن و، ئامانجە باڵاکان پیشانی مرۆڤ دەدات، تەنها ئایینە. ئەم وتانەش کە پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە هەیە، هی ئەوە "ئامانجی ڕاستەقینە ئایین پیشانی مرۆڤی دەدات. بەڵام زانستیش زۆر شتی پێیە بۆ وتن سەبارەت بەوەی داخۆ کام هۆکار و ئامێر بەکاردەهێنێت. زانست لە لایەن ئەوانەوە شێوەی خۆی وەردەگرێت کە دەیانەوێت بێ کەموکورتیی حەقیقەت فێرببن و، پاشان لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا دادەمەزرێت. بەڵام دیسانیش سەچاوەی ئەمە بەزۆری لە ئایینەوەیە. من ناتوانم وێنای

زانایەك بکەم کە خاوەنی ئیمانێکی قووڵ نەبێت"... لەڕاستیدا دەیەوێت بڵێت "زانستی بێ دین شەل و، دینی بێ زانستیش کوێرە."[١] زۆرێکی تریش هەمان ئەم هەست و بیرکردنەوەیەیان هەتا ئەمڕۆ هێناوەتە سەر زمان. ئێمە لێرەدا دەوەستین و بە هەندێك لەو شەیدا بێعەقڵانەی ڕۆژئاوا کە دەیانەوێت زانست بکەن بە ئامرازێك بۆ بێدینییەکەیان و، تەمەنیان بە لاسایی کردنەوەی کەسانی ترەوە بەسەر دەبەن، دەڵێین:

"بەڵێ، وەکو بیرمەندێکی ڕۆژئاوایی ئاماژەی بۆ دەکات، کاتێك ئێمە لە چوارچێوەی زانستیی هزرەکاندا گیر دەخۆین، دنیا تەخت و، لە ڕێسایەکی یەك ڕەهەندیدا، وەك میکانیزمێك دەبینین کە لە لایەن چەند یاسایەکی نەگۆڕەوە بەڕێوە دەچێت. کەچی لەدایکبوون و مردنی گەردوون دەگەن بە سنوورێکی وا کە چیتر هزرەکان هیچ بایەخێکی زانستییان نییە. بە مەبەستی تێگەیشتن لەم بابەتانەی کە ڕەهەندەکانی ئێمە تێدەپەڕێنێت، پێویستە گرنگیی بدەین بەو تەفسیر و دەستوورانەی کە زانست نایانزانێت، بەڵام ئایین دەیانهێنێت."

زانایانی هاوچەرخی وەکو ژان پییێر و ئێدینگتۆن کە بە باشی لەم مەرج و پێویستییە تێگەیشتوون -کتێبی "گەردوونی نەزانراو"ی ژان پییێر هەرچەندە هەندێك پان تەییزمی تێکەڵاو بووە، بەڵام لەم ڕووەوە موتاڵا کردنی بەسوودە- چەند بۆچوونێکی نوێیان بە پێچەوانەی ماتەریالیزمی زانستییەوە بەرهەم هێناوە و، شارێیەکی نوێیان کردووەتەوە و، پێشنیاری ئەوەیان بۆ جیهانی زانست کردووە کە تەنها لەم ڕێگەیەوە دەکرێت ئەو چەق بەستنەی کە لە زانستدا هاتووەتەوە کایەوە، بشکێنرێت. ئەم

---

١. ئەم وتەیە هی (سەعیدی نوورسی)یە. (وەرگێڕ)

ڕێگایەش هەمان ئەو ڕێی باوەڕ هێنانەیە بە خوای گەورە کە سەرجەم دینە ئاسمانییەکان ئاماژەیان بۆ کردووە.

لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە لە هیچ سەردەمێکی مێژوودا هێندەی ئەم کات و چەرخە، هەموو جۆر و لقەکانی زانست -تەنانەت زانستە ئەزموونییەکانیش بە ئەندازەیەکی دیاریکراو- لە خوا نزیك نەبوونەتەوە و لەگەڵ ئیمان و باوەڕدا تێکەڵاو نەبوون...

# ئیرادە

ئیرادە کە بە هێزی بڕیاردان یاخود بە "مەیل"ی کردن یان نەکردنی کارێك پێناسە دەکرێت، بریتییە لە ناونیشانی مرۆڤێتیی و تاقانە بناغەی ئەخلاق و ڕەوشت. بە بێ ئیرادە نە دەتوانرێت باسی فەزیلەت بکرێت نە مرۆڤایەتیی.

هەستی ئیرادە لە مرۆڤێکدا واتە خودهۆشیاری و بەئاگابوون لە خود. پێچەوانەی ئەمەش تێکچوون و بەزایەچوون دەگەیەنێت، هەر تاکێکیش دووچاری ئەم ڕووخانە ببێت، لە کردارەکانیدا بێ بڕیار و، لە بیرکردنەوەکانیدا سەرگەردانە. ڕزگاربوونیشی لەم دوودڵیی و سەرگەردانییە تەنها بەوە دەبێت بگەڕێتەوە و سەرلەنوێ خۆی بدۆزێتەوە و، لەگەڵ ئیرادەیدا یەك بگرێتەوە. ئەگینا بەپێچەوانەوە ئەو کەسە چاوەڕوانی دامەزراویی لە ڕۆحدا و، هاوسەنگیی لە ڕەفتاردا و، تێکۆشان لە ڕێگای "خۆبوون"دای لێ ناکرێت.

جووڵە و هەڵسوکەوتی بەئیرادە داخوازی بڕیار و پلانی لەپێشینەیە.

لەم ڕووەوە لەو بەدیهاتووانەدا کە دەیانناسین تەنها و تەنها مرۆڤە کە تایبەتمەندیی ئیرادە و هەڵبژاردنی ئازادانەی هەیە. بەدیهێنەری مەزن بە مەبەستی شەرەفمەند کردنی مرۆڤ و ناساندنی ئیرادەی ڕەهای خۆی بە مرۆڤ، لە دەروونی ئەودا ئیرادەیەکی جوزئی داناوە کە دەبێت بە بانگەوازکار و بەڵگە لەسەری. ئەم ئیرادەیە تەلیسم و مەتەڵەکان شیکار دەکات و مەشخەڵێکی وایە کە لە هەر جێگایەك دابگیرسێت، نوور و ئیرادەی ئەو زاتەی کە سەرجەم کات و شوێنەکان بەڕێوە دەبات لەوێ تەجەللی دەکات. ئەو مرۆڤەی کە ئیرادە هەندەکییەکەی پێکهێناوە لەگەڵ ئیرادەی هەمەکیی بەدیهێنەردا، بە ئیرادە سنووردارەکەی دەگات بە بێسنووریی و، لەکاتێکدا لاوازە بەهێز دەبێت و، کاتێك لە خودی خۆیدا هەژارە دەوڵەمەند دەبێت و، کاتێك لەڕاستیدا دڵۆپێکە دەبێت بە دەریا و، کاتێك لە بنەڕەتدا گەردیلەیە دەگۆڕێت بە خۆر و، کاتێکیش "هیچ"ی تەواوە دەبێت بە هەموو "بوون"!..

بەڵێ، ویستی مرۆڤ هەرچەندە سنووردارە، بەڵام بریتییە لە دیارییەکی خوایی کە لە ئیرادەی بێسنووری خواوە بەخشراوە بەم ناوازەترین بوونەوەرەی سەر زەوی. ئەو کەسانەی ئەم دیارییە وەك کلیلێکی ڕازئامێز دەبینن و بەکاریدەهێنن، دەتوانن داخراوترین بابەتەکان شیکار بکەن و، تاریکترین خاڵەکان ڕۆشن بکەنەوە و، دەرگا هەرە مەحکەم و پتەوەکان بکەنەوە و، بەنرخترین گەنجینەکان دەستی خۆیان بخەن.

ئیرادە، هەروەك تەنها فیکر نییە، کرداری ڕووتیش نییە. ئەو، هەروەك یەکەم سەرچاوە و بناغەی هێزی ڕۆح و، زیندەیی دڵ و، چالاکییە جەستەییەکانە، تاقە هۆکاریشە کە لە ناوەندی سەرمایەی کەم و کورتی

مرۆڤدا ڕێگاکانی هەتاهەتایی بۆ دەخاتە سەر پشت. ئەو کەسانەی هەوڵی دەست خستنی ئەم هۆکارە دەدەن، بە یەك جووڵە، هەروەك دەتوانن دنیایەك کێشە چارەسەر بکەن، بە هەمان جۆر سەبارەت بە خۆیان دەرگاکانی دۆزەخ دادەخەن و، ئەو ڕێچکانە دەدۆزنەوە کە دەچێتە سەر بەهەشت.

هەموو هزر و پەیامێك سەرەتا بە یارمەتیی نەخشە و بەرنامەکانی ئیرادە دێتە بوون. پاشان بەهۆی هێزی بکێش و گوڕمی پاڵنەری ئەوەوە هەوراز و نشێوەکان دەبڕێت. ئنجا دیسان بەهۆی ئەو نهێنییە ئاسمانییەی کە لە دووتوێی ئیرادەدایە بەردەوامیی دەست دەکەوێت و لە جێی خۆی دەمێنێتەوە. ماوەی نێوان ئێمە و "مانگ" بە باڵەکانی ئیرادە تێپەڕێنرا[1]. لوتکەی چیای "ئاگری"[2]بە یارمەتی ئەو کون و قوژبنی پشکنرا. زەریاکان بەهۆی ئەم مەشخەڵەی دەستی مرۆڤەوە ڕووناك بوونەوە و بوو بە هۆکارێك بۆ درەوشانەوەی ئیرادەی کوللی. لە ڕۆژانی ئاییندەشدا هەر بەم نوورە بەشێکی زۆری بۆشایی ئاسمان ڕۆشن دەبێتەوە و، دەبێت بە کتێبێکی ئامادە بۆ خوێندنەوە.

ئەوەی کە مرۆڤ ژیانی دڵی بپارێزێت و، لە بەرامبەر هەزار و یەك بەڵا و موسیبەتەوە خۆی ڕابگرێت کە چواردەوری تەنیوە و، ئارەزووە شەهەوانییەکانی تێپەڕێنێت و، لە مرۆڤێتیی خۆی تێبگات، دیسان پەیوەندیی بە زمان و دوعای ئیرادەوە هەیە. ئەو مرۆڤەی کە بە هەوڵ و ئیرادە پەیوەندیی لەگەڵ خوای خاوەنی میهرەبانیی ڕەهادا

---

١. مەبەست لێی ڕووداوی چوونە سەر مانگی مرۆڤە. (وەرگێڕ)

٢. چیایەکە لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ)

دروست دەکات، مانای وایە پاڵی بە هێزی ئەوەوە داوە و، چووەتە ژێر پارێزگاریی ئەوەوە و، لە تلێربوونەوە بۆ ناو شیو و کەندەڵانەکانی نەفس ڕزگاری بووە. بەڵێ، هەروەك هەموو بوون و بەرزبوونەوەیەك پەیوەستە بە باڵەکانی ئیرادەوە، بە هەمان شێوە سەرجەم ڕووخان و دابەزینەکان لە نزیکەوە وابەستی شکانی ئەو باڵانەن.

"بەلئام و بەرسیسا"[1] کە وەك هەڵۆی بەرزەفڕ وابوون و بەناو لوتکەکاندا گەشتیان دەکرد، لە بابەتێکی هەندەکیدا کە ئیرادەیەکی جوزئی دەویست و لە چرکەساتێکی بێناگاییدا، کەوتنە خوارەوە. کەچی لەناو کۆشك و تەلارەکانی عەزیزی میسردا و لەکاتێکدا کە هەموو لایەکی بە شەهوەت تەنرابوو، ئەو عەزیزی کوڕی عەزیزەی کە بە تاقە بورهانێکی[2] خوایی بەرپەرچی سەرجەم هێرشەکانی نەفسی دایەوە، بە ڕۆحە باڵا گرتووەکەی ڕەنگێکی جیاوازی بەخشی بە شکۆمەندیی و جوانییە فانییەکەی[3] و، سەری دەیدا لە جیهانی ئەودیو ئاسمانەکان!..

لە هەموو ساتێکی ژیاندا و لە بەرامبەر ئەو هەموو دێو و درنج و، دڕك و داڵەی کە خۆیان بۆ لایەنە لاوازەکانی مرۆڤ مەڵاس داوە، تەنها ئەو قارەمانانە دەتوانن بەرگە بگرن کە بە هێزی ئیرادە باڵیان گرتووە و لەگەڵ خوای خاوەنی توانستی ڕەهادا کە هەموو شتێکی

---

١. ناوی دوو ڕاهیبی ئەفسانەیین کە لە چاخە کۆنەکاندا تەمەنیان بە گۆشەگیریی و خواپەرستیی بەسەربردووە. بەڵام لە ڕووداوێکی بچووکدا شەیتان فریوی داون و ئیرادەیان شکستی خواردووە. (وەرگێڕ)

٢. مەبەست لە ئایەتی پیرۆزی ﴿لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ﴾. (وەرگێڕ)

٣. نووسەر مەبەستی لەوەیە هەرچەندە حەزرەتی یوسف بە جوانی بەناوبانگ بووە، بەڵام ئەو بە سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکاندا جوانییە دنیایی و لەناوچووەکەی گۆڕی بە جوانییەکی مەعنەوی و هەمیشەیی وا کە زۆر لەوەی یەکەمیان بەرزترە. (وەرگێڕ)

ئاسمانەکان و زەوی بەدەستە هاوسەنگییان سازاندووە. ئەو پاڵەوانانەی کە لەگەڵ هەموو ڕووداوێکی نوێدا زیاتر دەمەزەرد دەبنەوە و، بە بەڵا و موسیبەتەکان پتەو و بەهێز دەبن و، وەك لافاوێکی نوورانیی هەڵدەکوتنە سەر ئەو تاریکییانەی کە لە هەموو سووچێکەوە هێرش دەهێنن...

ئەو ڕۆحە کاڵ و کرچانەش کە لەگەڵ هەموو دەنگێکدا دەشپرزێن و، بە بچووکترین هەژان دەڕووخێن و، لەو جێیەدا کە دەبێت دان بەخۆیاندا بگرن گرفتاری پەرێشانیی دەبن و، هەست و نەست و بیرکردنەوەکانیان خۆی نەگرتووە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتییش ڕووناکییەکەیان چاوان بەر شەوارە بخەن و دڵان بخەنە جۆش و خرۆش، هێشتا هەر ناتوانن ببن بە ڕۆشنکەرەوەی هەمیشەیی و خەڵکان لە بەرزەخی سەرسامیی ڕزگار بکەن. نەك هەر ناتوانن ڕزگاریان بکەن، بەڵکو هەموو ژاوەژاوێك کە ئەم جۆرە کەسانە دەینێنەوە، دەبێت بە هۆکاری جووڵاندنی ئەو دوژمنە دەرەکییانەی کە ددانمان لێ تیژ دەکەنەوە و، ئاڵۆزبوون و سەختبوونی هەلومەرجەکان سەبارەت بە سەنگەری ئەوانەی کە خزمەت بە ئایین و وڵات دەکەن. لەکاتێکدا وەکو نەتەوە ناچارین، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت، خۆمان لەو قین و نەفرەتەی دوژمن بپارێزین کە بەدرێژایی چەندین سەدە کۆبووەتەوە و، ئەم تونێلی زەمانەیە بە سەلامەتی تێپەڕێنین. لەبەر ئەوە پێویستە:

"دەرەوە کەم و کورت، ناوەوە بەرز و مەزن بین،

نەك وەك فوارە، وەك گەرداو پڕ تەلیسم بین..."

ناچارین ببین بە کۆمەڵێك ڕۆحی زیندوو و، دڵی نەبەرد و، ئیرادەی بەرزەفڕ کە ڕوانینیان تەڵخ نابێت و، لە بەرامبەر ئەو زریان و ڕەشەبایانەی کە لە هەموو لایەکەوە هەڵدەکەن خۆڕاگر بین و، وەکو ئەو پشیلەیەی کە لە ڕێگای ئەبەدییەتدا ڕێنموونی یەکێك لە دۆستانی خوای کرد[١]، دامەزراو بین و هەمیشە چاومان لەسەر ئامانجەکەمان بێت.

تکاتان لێ دەکەم، باسی ئەوانەم بۆ مەکەن کە لەسەر هێلکەیەك دنیا دەکەن بە گارەگارا.. ئەمڕۆ ڕۆحی پەرێشانم، لە قووڵاییی دەریاکاندا، چاوەڕێی ئاوازێکی مەرجانیی ئەو کەسانەیە کە قوم لە ئازار دەدەن و، فرمێسك هەڵدەمژن و، لەناو خەمێکی خوێناویدا دەتلێنەوە.. ئاوازێکی هێندە بێدەنگ کە تەنها ڕۆحەکان دەتوانن هەستی پێ بکەن و هەتا بڵێی لە خۆدەرخستن بەدوورە!.. ئاوازێك کە ڕەنگی ناڵەی عاشقانی ئەم ڕێگایە دەداتەوە و لەبری وەستانەکانی[٢]، لەسەرخۆ و بەهێمنی دەڕژێتە دڵانەوە!..

١. یەکێك لە دۆستانی خوا کە ناوی (ئەبولحەجاجی ئاکسواری)ە دەگێڕێتەوە کە هێزی ئیرادە و کۆڵنەدان لە پشیلەیەکەوە فێربووە! دەڵێت ڕۆژێکیان دەچووم بۆ نوێژی بەیانی. پشیلەیەکم بینی دەیویست بە ستوونێکدا سەربکەوێت کە چرایەکی پێوە بوو. بەڵام چونکە ستوونەکە خلیسك بوو هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی. کاتێك لە مزگەوت گەڕامەوە بینیم پشیلەیەکە لە تەنیشت چراکەوە قنج لێی دانیشتووە. خوای گەورە لە ڕێگەی ئەو پشیلەیەوە وانەی ئیرادە و هەوڵدانی فێری من کرد! (وەرگێڕ)

٢. مەبەست لە وەستانی نێوان نۆتەکانی مۆسیقایە. (وەرگێڕ)

# مرۆڤ و به‌هاکانی

ئه‌و مرۆڤه‌ی که به چه‌قی ده‌رکه‌وتنی ناو و سیفه‌ت و کاروباره خواییه‌کان داده‌نرێت و، دره‌وشاوه‌ترین ئاوێنه و، کاملّترین میوه‌ی دره‌ختی بوونه‌وه‌ران و، پوخته و پێڕستی هه‌موو گه‌ردوونه، له ڕووی قووڵیی ناوه‌رۆك و ده‌وڵه‌مه‌ندیی ناخه‌وه له هه‌موو به‌دیهاتووان به‌رزتره و، ده‌ریایه‌که له شێوه‌ی دڵۆپێکدا و، خۆرێکه له چوارچێوه‌ی گه‌ردیله‌یه‌کدا و، هۆنراوه‌یه‌کی مه‌زنه له نوکته‌یه‌کدا و، هه‌رچه‌نده به ئه‌ندازه‌ی نینۆکێکه، که‌چی پێڕستی هه‌موو بوونه و، "وشه‌یه‌کی گشتگیر"ی وایه که ڕه‌وانترین وتاره‌کان له‌خۆده‌گرێت و، نهێنییه‌کی خواییه.

مرۆڤ به ئه‌ندازه‌ی فراوانبوون و کرانه‌وه‌ی به‌گوێره‌ی ئه‌و ئامانجه‌ی که بۆی به‌دیهاتووه، ده‌بێت به ڕه‌نگینترین ئاوێنه‌ی خوای هه‌ره مه‌زن و، گۆیاترین ته‌رجومان و، له‌م جیهانه سنووردراوه‌دا ناونیشانی ڕه‌هایی و بێسنوورییه. گه‌ردوون ته‌نها له سایه‌ی تێگه‌یشتن و به‌سیره‌تی ئه‌ودا شێوه‌ی پێشانگایه‌کی وه‌رگرتووه که به‌چێژه‌وه ته‌ماشا ده‌کرێت و، حاڵه‌تی کتێبێکی وه‌رگرتووه که شایانی خوێندنه‌وه‌یه. ده‌توانرێت بوترێت

"ئەو" بەهۆی ئەم قووڵیی و دەوڵەمەندییەی کە وەکو ماتەوزەیەك لە سروشتیدایە، ڕۆحی سەرجەمی گەردوونە و، لەناو هەموو بوونەوەراندا تاقە بوونەوەرێکە کە بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی و بێ تێکەڵاو کردن بەدیهێنەر نیشان دەدات و، ڕاستگۆترین شایەتە لەسەر ئەو و، وەکو قیبلەنمایەکی هەستیاری سەرنەکەر هەمیشە ئاماژە بە بەدیهێنەرەکەی دەکات.

ئەو مرۆڤە ڕاستەقینەیەی کە خولگەی خۆی دۆزیوەتەوە، یاخود لەسەر ئاڕاستەی دروستی خۆیەتی، هەروەك شایەتە لەسەر خوای گەورە، بەهەمان شێوە ڕابەری ڕێبوارانیشە. ئەو کەسەی ئەو ببینێتەوە، حەقیقەتیشی بینیوەتەوە و لە هەموو پەرێشانییەکان قوتاری دەبێت. کەسێك سەیری مرۆڤێکی لەم جۆرە بکات -ئەگەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت- مانای وایە لە شێوەی شەپۆلی تەجەللییە جیاوازەکاندا، هەموو شتێکی بینیوە و هەستی پێ کردووە.. بەڵێ، مرۆڤێك کە بیرکردنەوەکانی بەقەدەر باوەڕەکەی ڕوون و بێگەردە و، هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بەگوێرەی بۆچوون و باوەڕیەتی و، لە هەموو کارێکیدا ڕەزامەندیی خوا ئامانجیەتی، هەر کاتێك ببینرێت خوای گەورە یادی خەڵکی دەخاتەوە و، بێ ویستی خۆی، بگات بە هەر شوێنێك وەك شایەتێکی لێ دێت لەسەر حەقیقەت.

شانازیی مرۆڤایەتی، حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ)، سەرەتا بەهۆی توانا و لێهاتن و بەهرەکانی و، پاشان بەهۆی فراوان بوون و کرانەوەی توانا و لێهاتنەکانی، لە ئاسۆگەلێکدا شاباڵی گرت کە لە سەروو توانای فریشتەکانەوەیە و، هەم تۆو و هەم میوەی درەختی

بوونەوەران بوو. ئادەمیزاد چەند شانازی بکات بەوەی کە بەشێکە لەو درەختە ناوبراوە و، چەند ستایشی ئەو میوە ناوازەیە بکات کە گرتوویەتی، هێشتا هەر کەمە. لەڕاستیدا کاتێك دەوترێت "مرۆڤی کامڵ" یەکسەر ئەو بە خەیاڵدا دێت. بینینی مرۆڤێکی تر لە جیهانی بوونەوەراندا کە بە ماهییەتە مرۆییەکەی بە ئەندازەی ئەو بەرزبووبێتەوە بۆ لوتکەکان، کارێکی مەحاڵە. بەڵام دیسانیش ئەو میوە مەزنە بەروبوومی درەختی مرۆڤایەتییە. مرۆڤ بەرێزترین بەدیهێنراوە و، حەزرەتی محمدیش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) مایەی شانازیی ئەم بەرێزترین جۆرەیە.

کاتێك سەرتاسەری گەردوون لە تەنیشت ئەم مرۆڤە ناوازەیەوە دادەنرێت، ڕاستەوخۆ دەردەکەوێت کە نرخی ئەو (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە هەموویان زیاترە. ئەگەر بوترێت نەك هەر تەنها دنیا، بەڵکو تەنانەت دوارۆژیش لەبەر خاتری حەقیقەتی فراوانی ئەو نەخشەی بۆ کێشراوە، ئەم وتەیە زیادەڕەویی تێدا نییە و لە جێی خۆیەتی. "ئەو" لە هەمان ئەو کاتەدا کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەم دنیایەدا بەردەوامە، هەست بە ئەودنیاش دەکات و، بە هیوا و خۆزگەکانی ئەوێ ئازار و خەمەکانی ئێرە هێور دەکاتەوە و، بە ئەندازەی فراوانیی ئەو ئیمانە سەرسوورهێنەرەی خاوەنیەتی، پێش ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە، لە قووڵاییەکانی ویژدانیدا هەمیشە لە بەهەشتەکاندا ژیاوە و، ئەم هەستەشی لەگەڵ ڕێبوارانی هاوڕێیدا بەش کردووە. پێویستە جارێکی تریش دووپاتی بکەمەوە کە ئەو سەرەڕای ئەم فراوانییەشی، مرۆڤێکە و نوورانیترین میوەی درەختی توبای مرۆڤایەتییە.

گەرچی مرۆڤ لەڕووی ماددە و جەستەیەوە لەم مەزهەرییەتانە

دوور دیارە. تەنانەت ئەو کاتانەی کە بێئاگا لە ماهییەتی خۆی دەژی، دەتوانرێت بوترێت کە دەکەوێتە خوار ئاستی زیندەوەرانی تریشەوە. بەڵام هەمان ئەم مرۆڤە، بە ژیری و، ئیمان و، ویژدان و، ڕۆحی، تەماشاکارێکی وردبینی ئەم پێشانگای بوونەوەرانەیە و، موتاڵاکارێکی خاوەن شعووری کتێبی بوونەوەر و ڕووداوەکانە و، چاودێرێکی لێکۆڵەر و ڕاڤەکارێکی ئەو نهێنییانەیە کە لەنێو دێڕەکانی بووندا شاراوەتەوە. هەر بۆیە ئەو چەندیش بێبایەخ دەربکەوێت، هێشتا لە مەزنترینی شتەکان بەڕێزتر و ڕێزلێگیراوترە و، لەو ڕووەوە کە بەندەی خوایە پادشایە و، سەرەڕای بچووکییەکەی لە هەموو گەردوون مانادارتر و پڕترە.

ئەم ئادەمیزادەی کە بەم ئامێر و کۆئەندامە مەزنانەوە ڕەوانەی دنیا کراوە و، بەگوێرەی توانا و لێهاتنەکانی ماهییەتی، بەرەو ئامانجە هەرە گرنگەکان ئاراستە کراوە، لەناو سەرجەم دین و سیستەمە جیاوازەکاندا تەنها ئیسلام توانیویەتی ئەم مرۆڤە لە پایە و پێگەی تایبەتی خۆیدا ڕاڤە بکات و، بێ ئەوەی دووچاری زیادەڕەویی و کەمڕەویی ببێت شیکاری بکات.

بەگوێرەی ئیسلام، مرۆڤ لەبەرئەوەی مرۆڤە، بەڕێز و ڕێزلێگیراوە. ئەو، بە گرێدانی پەیوەندیی لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا (عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئەم یەکەمین پایە جێگیرە دەستی خۆی دەخات. بەتایبەت لە سایەی ئەو هەوڵ و تێکۆشانەدا کە لەپێناوی بیروباوەڕیدا دەیدات، دەبێت بە خۆشەویستی خوا لەسەر زەوی. قورئانی پیرۆز لە ئایەتەکانی تری هاوشێوەی ئەمانەدا کە باس کران، هەمیشە لە چەند ڕەهەندێکی جیاوازەوە بڵندیی پایەی مرۆڤمان بۆ بەیان دەکات. بەڵێ، هەریەك لە

ئیمان و، هه‌وڵ و، کرداری چاکه و، هه‌موو ئه‌و شته جوانانه‌ی تر که مرۆڤ بووه به شوێنگه‌یه‌ك بۆ ده‌رکه‌وتنیان، وه‌کو چه‌ند بینایه‌ك وان که له‌سه‌ر به‌ها مرۆییه‌کانی ناو ئه‌و دامه‌زراون و، چه‌شنی کۆمه‌ڵێك نه‌خش وان که له‌سه‌ر ته‌ختی ئه‌و چنراون. مرۆڤ هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی که دوای هاتنه ژیان به‌ده‌ستیان ده‌هێنێت، که‌م تا زۆر، له‌ژێر ناونیشانی ئیراده و، هه‌وڵ و، تێکۆشاندا چه‌ند کرێ و نرخێك ده‌دات، به‌ڵام یه‌که‌م به‌هره که پێی ده‌وترێت "مرۆڤ بوون"، به‌بێ به‌رامبه‌ر پێی ده‌به‌خشرێت و، دیارییه‌کی خوایی و، جه‌برێکی لوتفییه.

هه‌موو په‌یوه‌ندییه مرۆییه‌کان له‌سه‌ر بنه‌مای مانا و ناوه‌رۆکی ئه‌م چوارچێوه‌یه داده‌مه‌زرێت و هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌م بناغه‌یه‌ش به‌رده‌وام ده‌بێت. هه‌موو مرۆڤێك به‌رێز و، ده‌ستلێنه‌دراو و، پارێزراوه، ئیتر پیاو بێت یان ژن، گه‌نج بێت یان پیر، ڕه‌ش بێت یان سپی. ده‌ستدرێژیی ناکرێته سه‌ر نامووسی و، ده‌ست بۆ ماڵ و موڵکی درێژ ناکرێت و، له خانه و لانه‌ی خۆی ده‌رناکرێت و، سه‌ربه‌ستیی لێ ناسه‌نرێته‌وه و، ڕێگه له پراکتیزه کردنی بیروباوه‌ڕه‌کانی ناگیرێت و، ته‌نانه‌ت ڕێگه نادرێت ئه‌م شته خراپانه به‌رامبه‌ر به خودی خۆیشی بکات و، ده‌رفه‌تی به‌زایه‌دانی ئه‌م به‌ها مرۆییانه‌ی پێ نادرێت که له لایه‌ن خوای گه‌وره به خه‌ڵات پێی به‌خشراوه، چونکه ئه‌و به ئه‌مانه‌ت خاوه‌نی ئه‌م به‌هایانه‌یه. خاوه‌ن موڵکی ڕاسته‌قینه خوایه. ئه‌و ته‌نها به‌رپرسیاره له پاراستنی ئه‌م سپاردانه له به‌رامبه‌ر به‌دیهێنه‌ره‌وه. پێویسته ئه‌و سپاردانه‌ی که به شێوه‌یه‌کی کاتی پێی به‌خشراون وه‌کو چاوی خۆی بیانپارێزێت.. نه‌هێڵێت بچووکترین زیانیان پێ بگات.. ئه‌گه‌ر پێویستیشی کرد له‌م پێناوه‌دا ده‌جه‌نگێت

و دەمرێت. "سوڵتانی وشە" (عَلَيهِ أَفْضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَسْلِيمِ) دەفەرموێت "هەركەسێك لەپێناوی ماڵەكەیدا بمرێت شەهیدە، هەركەسێك لەپێناوی گیانیدا بمرێت شەهیدە، هەركەسێك لەپێناوی كەسە نزیكەكانیدا بمرێت شەهیدە و هەركەسێك لەپێناوی لانە و نیشتمانیدا بمرێت شەهیدە." بەم جۆرە ئاماژە بە دەستلێنەدراویی و پارێزراویی ئەم مافە مرۆییانە دەكات و، هێما بۆ ئەو بەرزی و مەزنییە دەكات كە لە سروشت و بەدیهاتنی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە. لەم ڕۆژگارەدا مرۆڤایەتی لە كوێی تێگەیشتنێكی لەم جۆرەدایە؟ پێم وایە گفتوگۆ كردن لەمەڕ بابەتێكی لەم چەشنە چوارچێوەی ئەم وتارە دەبەزێنێت.

لە تێبینییە ئیمانییەكانیشدا دیسان مرۆڤ خاوەنی نایابترین مەزهەرییەتە. بەڵێ، مرۆڤ لە هەمبەر گەردوون و ڕووداوەكانی ناویدا، لە ئاسمانەكان فراوانتر و لە فریشتەكانیش باڵاترە. هەموو شتێكی ناو ئاسمانەكان و زەوی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ژێربار خراوە بۆ ئەو و، مافی بەكارهێنان و ڕێكخستنیانی پێ بەخشراوە. ئەو بەدیهێنەرەی كە مرۆڤی وەكو میوانێك ڕەوانەی ئەم جیهانە كردووە، بەزەیی بە پێویستیی و لاوازی و هەژاری ئەودا هاتووەتەوە و، ڕام كردن و ژێربار خستنی بەدیهاتووان و پێدانی مافی دەست تێوەردان تێیاندا بە مرۆڤ، جگە لە دیاری و بەخششێكی خوایی هیچی تر نییە. بەخششێكی لەم شێوەیە تەنها بەهۆی شعووری ئیمانەوە هەستی پێ دەكرێت و بە ویژدانی ئیماندارانەش نرخی دەزانرێت و هەڵدەسەنگێنرێت.

باوەڕدارێك كە بە ئەندازەی فراوانیی ئیمانەكەی چاوی كراوەتەوە بەڕووی ئەودیو پەردەی شتاندا، سەرتاپای ئەم گەردوونە بە كۆشك و

تەلاری خۆی دەزانێت و، هەموو شتێکی گیاندار و بێگیانیش وەك چەند کارمەندێك دەبینێت کە خراونەتە ژێر فەرمانیەوە.

هەنگاوێك دوای ئەمە، حاڵەتی ئەو مرۆڤە کامڵانە دێتە پێشەوە کە میکانیزمی ویژدانیان کەوتووەتە گەڕ و، مافی تەواویان بە ئیرادەی خۆیان داوە و، بە پلەکانی ژیانی دڵ و ڕۆحدا گەشت سازدەکەن و، قوم لە چێژە مەعنەوییەکان دەدەن. پێویستە دان بەوەدا بنێم کە پێشبینی کردن و قەبڵاندنی مەزهەرییەتێکی لەم جۆرە سەبارەت بە من کارێکی گرانە. ئەگەر شتێك هەبێت بوترێت بەرامبەر بەم مرۆڤانەی کە بە فراوان کردنی بەهاکانی ناخیان -کە وەك وزەیەك تیایاندایە- گەیشتوون بە لوتکەکان، ئەوا پێویستە وەك عاکیف بڵێین:

"ماهییەتی ئەو تەنانەت لە فریشتەکانیش مەزنترە.

جیهانەکان لەودا پەنهان و دنیاکان لەودا شاراوەن."

داخۆ چی چاوەڕێ دەکرێت لەم مرۆڤەی کە شەرەفمەند کراوە بەم هەموو بەهرە و توانا و لێهاتنانە؟ بەڕای من لە هەمووی گرنگتر ئەمەیە. بایەخ بەم خاڵە دەدرێت یان نا، ئەوە بابەتێکی ترە، بەڵام خۆزگە هەستمان بە لێپرسراوێتییەکی لەم شێوەیە دەکرد کە هاوشانی مرۆڤ بوونە..!

# دیوەکەی تری مردن

زۆرکەس وەك کۆتایی هاتنی هەموو شتێك و، لەناوچوون و، پووکانەوە و، داڕووخان و، بوونەوە بە خاك لە مردن دەڕوانن و، بە هیچ شێوەیەك حەز ناکەن ڕووبەڕوو ببنەوە لەگەڵیدا. کاتێك ئەو شتانەی کە بە هۆکاری مردن دادەنرێن وەك نەخۆشی و، پیری و، جەنگ و، ڕووداوەکانی هاتوچۆ و هاوچەشنیان ڕوودەدەن، ئەو لەرز دایدەگرێت و، بیر لە تەنیایی و نامۆیی ناو گۆڕ دەکاتەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا موچڕکە بە لەشیدا دێت و، ژیانی خۆی دەگۆڕێت بۆ ئازار و ئەشکەنجەیەك کە بەرگەگرتنی لە توانای مرۆڤ بەدەرە.. بەڵێ، لە دیدی ئەم کەسانەدا کاتێك مرۆڤ مرد هەموو شتێك تەواو دەبێت. هەموو شتێك و هەموو شوێنێك تاریکیی دایدەپۆشێت. وەك شاعیر دەڵێت:

"ئیتر خۆر نابینرێت، بە ئاسوودەیی چاو لێکنێ

مـــەرگ و مـــردن خەونێکی بێکۆتاییـــە"

مرۆڤێك كە لە ڕاستیدا بۆ ئەبەد خوڵقێنراوە و، دەزگیرانی هەتاهەتاییە، ڕوون و ئاشکرایە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە چەند ئازاری دەدات. بۆ کەسێك کە گوێ لە ویژدانی خۆی دەگرێت، ئەم ئارەزووی هەمیشەیی و مانەوەیە بە ڕستەی "هەموو دنیا هیی من بێت، خەمم تەواو نابێت، لەبەر چی؟!" دەردەبڕێت، ئەمەش شایانی ئەوەیە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت.

ئەمە لەکاتێکدا هەروەك مردن لەناوچوون و، پووکانەوە و، داڕمان و، تەواوبوون و، بوون بە هیچ نییە، گۆڕیش چاڵی بوون بە خاك و، خانەی ترسناکی تەنیایی و نامۆیی نییە. ئەو مرۆڤەی کە بەگوێرەی نەخشە و حیکمەت و بەرنامەیەکی دیاریکراو بەدیهێنراوە، بەهەمان شێوە بەگوێرەی چەند بەرنامە و حیکمەتێکی تر کە لە مردندا هەیە، لە ڕەهەندێکەوە بۆ ڕەهەندێکی تر دەگوازێتەوە و، حاڵەت و بارودۆخ دەگۆڕێت و، بەگوێرەی بەروبوومی کردەوەکانی دەچێتە قاڵبی بوونێکی جیاوازترەوە و، لەکۆتاییدا دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی ڕەسەنی خۆی و، ڕۆحە سروشتیی و ڕاستڕەوەکان بەگوێرەی پلە و پایەی کردەوەکانیان داخڵی ڕاڕەوی بەیەك گەیشتن دەبن و، شاد دەبن بە بینینی بەدیهێنەری مەزن و، قوم لە ڕەزامەندیی خوایی دەدەن. بەهەمان شێوە گۆڕیش بیرێکی تاریك و، ژووری دابڕان و، چاڵێك نییە بە نەبوون دەورە درابێت وەك ئەوەی گومان دەبرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەرگایەکە بەڕووی ڕووناکییەکاندا دەکرێتەوە و، ڕاڕەوێکە ئادەمیزاد دەگەیەنێت بە جیهانە نوورانییەکان و، پلیکانەیەکە بۆ سەرکەوتنی ڕۆح بۆ ئەودیوی سروشت. ئەو کەسانەی کە لە بەرامبەر شاهیدی ئەزەلیدا فەرمانبەریی ڕەسمیی سەرشانیان تەواو کردووە، یان ئەوانەی کە وەك سەربازێك نێرراون بۆ ئەم دنیایە، ئیمانیان بە عیبادەت و،

عیبادەتیان بە ئیحسان ڕازاندووەتەوە و قووڵییان پێ بەخشیوە و، بەتەواوەتی ئامادە بوون بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی، بەم ڕاڕەوەدا دەڕۆن، هاوڕێ لەگەڵ بەختەوەرییەکدا کە چاو نەیبینیوە و، گوێ نەیبیستووە و، دەستی خەیاڵیشی بەرنەکەوتووە.

بەڵێ، مردن سەبارەت بە ئێمە، هیچی تر نییە جگە لە دەست پێ هەڵگرتن لە ئەرکی بەندایەتیی و، گەیشتنی ڕۆح بە "شوێن"ێك کە فرەڕەهەندە و هەمیشە تیایدا لە گەشت و گەڕاندایە و، بە "کات"ێك کە لێوانلێوە لە قووڵی و، بریتییە لە وتنی "دەی ئێستا بەتەواوەتی وەرە بۆ لای من!" لە لایەن خوای گەورەوە. سەبارەت بە ئەوانەی کە لە دڵەوە "ئەو"یان ناسیوە و خۆشیانویستووە، لە شێوازی وتنی ئەم "وەرە"یەدا ئاوڕلێدانەوە و ڕووتێکردنێکی هێندە سەرسامکەر بوونی هەیە، ئەو ڕۆحەی کە بانگەوازێکی لەم جۆرە دەبیستێت، چیتر نایەوێت تەنانەت خولەکێکیش لێرە بمێنێتەوە. چونکە ئەم بانگە واتە خۆت لە ناڕەحەتی و ئازار و ئێشەکانی دنیا ڕزگار بکە.! واتە بگەڕێوە بۆ نیشتمانی ئەسڵیی ڕۆح و بەهەشتە لەدەستدراوەکەت. ئەو کەسانەی کە لەم ڕووەوە مردن بە بانگەوازی ئاوڕلێدانەوەی خوایی قبووڵ دەکەن، هاتنە دنیا بە فەرمانبەریی و سەربازیی و، کۆچ کردنیش لێی بە تەواوبوونی کارگوزاریی و، لەدایکبوونی دووهەم و، چاوکرانەوە بەڕووی بوونێکی ئەبەدیدا دەزانن و، مەردانە بەرەو گۆڕ دەڕۆن. لە دیدگای ئەواندا هاوڕێیەتی لەگەڵ عەزرائیل وەکو دۆستایەتی لەگەڵ ئیسرافیل وایە، بە ڕابەرایەتی جیبریل و وەك ئەوەی بەرزببنەوە بۆ میعراج، چێژ لە هەموو چرکەیەکی ڕۆیشتن بەرەو خوای گەورە وەردەگرن. لەڕاستیدا

ئیماندار چوونە ناو گۆڕ وەك کرداری دانانی تۆوێك دەبینێت کە بە مەبەستی سەوزبوون و زۆربوون لە سینەی خاکدا دەچێنرێت، بە تۆوێکی ناو ئاوی مەنیی دەزانێت کە بەرەو مرۆڤبوون ڕادەکات.

چ تۆوێك هەیە خرابێتە ناو خاك و گوڵی نەگرتبێت.! چ تۆوێکی مەنیی هەیە کەوتبێتە ناو منداڵدانی دایك و مەحکووم بوویێت بە عەدەم! خوای گەورە مرۆڤی شەرەفمەند کردووە بە ڕۆحی خۆی و توانا و لێهاتنێکی وای پێ بەخشیوە کە کردوویەتی بە دەزگیرانی جاویدانی. ئەگەر جەستە بپرتووکێت و لەناویش بچێت، ڕۆح لە سایەی بەدیهێنەرەکەیدا بۆ هەتاهەتایە دەژی. خۆی لە خۆیدا ئەوانەی دەزانن ئەو زاتەی گیان دەکێشێت هەمان ئەو کەسەیە کە گیانی بەخشیوە، مردن بۆ ئەمانە هەنگوین و قەیماغە. سەبارەت بەوان مەرگ و گۆڕ پەردەیەکە و، ئاهەنگ و شادییەکی تەواونەبوو هەیە، تۆزێك لەولاوە.

ئەگەر دیوی پشتەوەی مردن ئەمە بێت و تەنها لە ڕووە جەستەییەکەشیەوە تەماشای بکرێت، ئەوا پێویستە لەبری گریان و شیوەن کردن بۆ شکان و پرتووکانی قەفەسی جەستە، خۆشحاڵبین بەوەی لە زیندانێکی تەسکەوە بەرەو باخ و باخچە فراوانەکان دەمانگوازێتەوە. چونکە ئەو جیهانە ئەفسووناویی و سەرسوورهێنەرەی کە لە دڵماندا هەستی پێ دەکەین و، هەموو شەوێك لە ڕێگەی دەلاقەی خەونەکانمانە خەندە دەبارێنێت بەسەر ڕۆحماندا، تەنها یەك دانە پردی هەیە. ئەویش مردنە، ئەو مردنەی کە لە بازنەی فەرمان و مۆڵەتی خواوە دێت... ئارەمانێکی خۆشەویستیی کە لە حەقیقەتی مردن تێگەیشتووە و، دڵی بە ئیمان و، هەستەکانی بە عەشق و هەیەجان قوڵپ دەدات، بە هەزار

و یەك گیانەوە بەرەو خۆشەویست ڕادەکات. کاتێکیش دەگات بە ئەو، بوونی دنیایی وەکو شەکر دەتوێتەوە و دەبێت بە شەربەت. دەگۆڕێت و دەگات بە ناسکیی و نیانیی بەدیهاتووانی ئاخیرەت... بە ئاوازی "حي، حي"یی ڕۆحانییەکان و دەنگی باڵی فریشتەکان خۆی دەشوات. لە کاتێکدا کەسانی تر بەهۆی چڵکەکانی نەفسیان دەبن بە سەرچاوەی قێز و بێز بۆ دەوروبەریان و، لە کاتێکی بێ بڕانەوەدا هەڵدەشێلرێن لەگەڵ ئازارگەلێکدا کە سەرەتا و کۆتایی نییە، ئەوان چەشنی گوڵ ئەم دەست بۆ ئەو دەست دەبرێن و، بگەن بە هەر جێیەك وەك میسك و عەنبەر بۆن دەکرێن. فەرمانڕەوای گیانەکان سوڵتانێتییەکی وەهای خەڵات دەکات کە سەر تووشی سووڕان و چاو دووچاری ئەبڵەق بوون دەکات.. هەمیشە بە ڕووتێکردن (توجە)ی نوێ چاکەی لەگەڵدا دەکات.. مامەڵەی تایبەت و پێشوازیی لێ دەکرێت.. خوای گەورە بە جوانیی خۆی ئاسۆی ئەو دەڕازێنێتەوە. بەستەی ڕەزامەندیی خۆی دەدات بە گوێدا و، کاسە لەسەر کاسە جوانیی دەرخواردی ڕۆحی دەدات. ئەو قارەمانی مەعریفەتەی کە "هەبوون"ی بە غەنیمەت زانیوە، لە هەر یەکێك لە مەنزڵەکانی بازاڕی دوارۆژدا بە ئەندازەی ئیمان و عەشق و شەوقەکەی، وەکو ئەڵماس و مرواریەکان تەماشا دەکرێت و، لەکاتێکدا ئەوانەی خراپ کەڵکیان لە ژیانیان وەرگرتووە بە ترسەوە لە تاریکایی ئەنگوستەچاودا ڕێ دەکەن، ئەوان هەردەم ڕووناکی دەبینن، هاودەمی ڕووناکی دەبن، لە کەشی ڕووناکیدا بەیانی و ئێوارە دەکەنەوە، قوم لە ڕووناکی دەدەن و لەناو ڕووناکیدا سەرمەست دەبن. هەرگیز شەو ناگات بە ئاسۆی ئەوان و قەت ئاوابوون کەلی ئەوان تاریك ناکات. ئەو بەختەوەرەی کە خێوەتەکەی لە

ئاسۆیەکی لەم چەشنەدا هەڵداوە، هەردەم لەو بەرزاییانەدا دێت و دەچێت کە مەبەست و ئامانجی بەدیهێنانی هەستە مرۆییەکانن و، لە ئاسۆی ئیرادەوە بۆ لوتکەی شعوور و، لە لوتکەی شعوورەوە بۆ عەرشی دڵ بەرزدەبنەوە و، لە هەر بورجێکدا کە پێی دەگەن، خۆیان لەسەر سفرەیەکی جیاوازی توانا و لێهاتنەکان دەبیننەوە، هەست بە چێژێکی جیاوازی تەماشاکردن و بینین دەکەن. ئەمانە کۆمەڵێك بەخششی وان کە لە سەروو تێگەیشتنەکانەوەن و، ئەگەر هەندێك لە پیاوچاکان لە دنیادا تامی بەشێکیشیان بکەن، چەشتن و هەست پێ کردنی تەواوەتییان تایبەتە بە دوارۆژەوە.

ئیماندارێك کە ئەم تایبەتمەندییەی دەستگیر بووە، هەنگوینێك کە لە هیچ شانەیەکدا دەستی ناکەوێت و، قەیماغێك کە لە هیچ شوێنێك دەست نایگاتێ، ئەو لە نێوان زمان و مەلاشوویدا دەیدۆزێتەوە. لەو دنیا ئەفسووناوییەدا کە ئەم زەوی و ئاسمانە ئاسراوەی تێدا نییە، هەموو شتێك لە چواردەوری ئەو سەرچاوەی جوانی و فەیزانەدا بەیانی و ئێوارە دەکاتەوە، ئەم بەندەیەش تەنها "ئەو" دەبینێت، "ئەو" دەبیستێت، بە هێزی ڕاکێشانی "ئەو" سنووری ماهییەتی خۆی تێدەپەڕێنێت و، دەبەسترێتەوە بە نووری بوونی "ئەو"ەوە و دەبریسکێتەوە.. دەبێت بە نموونەیەکی بەرجەستەی حەقیقەتی:

"شوعلەیەکی وای هەیە شەمعی جان،

لە فانۆسی ئاسماندا جێی نابێتەوە."

(غالیب)

ئەگەر لە ڕێگەی پردی مردنەوە مرۆڤ بگات بەم هەموو درەوشانەوەیە، بەڕای من پێویستە مردن شیرینترین هیوای ئادەمیزاد بێت.. بەڵام هەروەك بانگ کردن بۆ ژیان و مەزهەرییەتەکانی لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە، بە هەمان شێوە ویستن و ئارەزووکردنی مەرگیش مافی ئێمە نییە. هەر کاتێك بەدیهێنەر بانگمان بکات بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ئەو ڕادەکەین، کاتێکیش وترا "کەمێکی تریش بمێننەوە"، لە بەرامبەر ویساڵەوە ئارام دەگرین و دان بە خۆماندا دەنێین.

# ئومێد

خۆمان لە عارفەی چەندین مەحاڵی گەورە و جددیدا دەبینینەوە. ژان لەسەر ژان هەناوی کۆمەڵگا دەهەژێت و لە لێواری زایینی چەندین شتی نوێدایە... ئەو خەڵکە ڕەشۆکانەی بەدرێژایی چەندین ساڵ بە هەزار و یەك دژیەکیی لە خەتی تایبەتیی خۆیان دوورکەوتوونەتەوە، نائومێدن لە ئایندە و دەترسێن لێی. دڵان بێ دەرمان.. زیهنەکان هەژار.. ئیلهامەکانیش بێڕەنگن...

خەڵکانێکی زۆری پەرێشان کە گیان هاتووەتە سەر لێویان و، دنیای ڕۆحیان لەرزیوە و، داهاتوویان لێوانلێوە لە ئاژاوە و قەیران، چاوەڕوانی هێز بۆ ئەژنۆ و ڕووناکی بۆ چاویان دەکەن. هەنووکە گرنگترین شت سەبارەت بە کۆمەڵگا ئەوەیە کە خەڵکی ئاسایی پەیامی ئیمان و ئومێد لەو کەسانەوە وەربگرن کە هیوای ژیان و بەختەوەرییان پێیان هەیە.

ئومێد پێش لە هەر شت کاری ئیمانە. مرۆڤی باوەڕدار خاوەنی ئومێدە و ئومێدەکەشی بە ئەندازەی ئیمانەکەیەتی. لەم ڕووەوە باوەڕێکی

پتەو لە لایەن هەندێك كەسەوە بە زۆر شت و، لە لایەن هەندێكی تریشەوە بە شتێكی نائاسایی دادەنرێت. لەڕاستیدا كاتێك ئومێد و، هەوڵ و، بەردەوامیی و، دامەزراویی دەچنە دڵێكی پڕ لە ئیمانەوە، سنوورەكانی مرۆڤی ئاسایی تێدەپەڕێنرێت. ئەوانەی خاوەنی ژیانی دڵ نین لەم ئاستەدا، ئەم ڕووداوە بە نائاسایی لە قەڵەم دەدەن.

بەتایبەت ئەگەر مرۆڤ ئەو شتەی باوەڕی پێ دەهێنێت بە باشی هەڵیبژێرێت و، دڵی پێ بدات، ئیدی لە دنیای ڕۆحی ئەودا شتێك نامێنێتەوە بە ناوی نائومێدیی و، ڕەشبینیی و بەدبینیی.

تاك بە ئومێد دەگات بە بوون، كۆمەڵگاش بەهۆی ئەوەوە گەشە دەكات و پێش دەكەوێت. هەروەك مرۆڤێك كە هیوای خۆی دۆڕاندووە بە هەبوو ئەژمار ناكرێت، بە هەمان جۆر كۆمەڵگایەكی مەحرووم لە ئومێدیش نیشانەی ئیفلیجییەتی.

ئومێد بریتییە لەوەی ئادەمیزاد ڕۆحی خۆی بدۆزێتەوە و هەست بە هێزی ناوەوەی بكات. بەم هەست كردنە مرۆڤ پەیوەندیی لەگەڵ توانستی ڕەهای ئەودیو گەردوون گرێ دەدات و، دەگات بە هێز و توانایەك كە بەشی هەموو شتێك بكات. لە سایەی ئەمەدا گەردیلە دەبێت بە خۆر و، دڵۆپ بە دەریا و، بەش بە گشت و، ڕۆحیش دەبێت بە هەناسەیەكی گەردوون.

پێغەمبەر ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) لە كاتێكدا ئاسمانی ڕەش داگەڕا و، هیوای تێكشكا و، گیان هاتە سەر لێوی، بە ئومێد خۆی ڕاتەكاند و، وتی ”ستەمم لە نەفسی خۆم كرد“ و، زیندوو بوویەوە. كەچی شەیتان

لەناو خوێن و زوخاوی ئەو نائومێدییەی کە لە دڵیەوە هەڵقوڵابوو، کەوتە پەلاقاژە و، لە کۆتاییشدا تیایدا خنکا...

هەموو پاڵەوانێك بە مەشخەڵێکی ئومێدەوە کەوتووەتە ڕێ و، بەمە سنگی داوەتە بەر تۆفانەکان و، لەگەڵ زریانەکاندا دەستەویەخە بووە و، زۆرانی لەگەڵ شەپۆلەکاندا گرتووە. لە هەندێکدا ئومێد بووە بە تۆوی "جوودی" و، لە کۆمەڵێکدا بووە بە باخی ئیرەم و، لە هەندێکی تریشدا بووە بە "یەسریب"ی گۆڕاو بە "مەدینە". لەم دۆڵەدا هەموو قارەمانێکی ئومێد، لە هەمان کاتدا ڕێزلێگیراوی لای خوا بووە و، ئاڵا و مەشخەڵی خەڵکیش بووە.

کۆیلەیەکی بەربەری کە بە ئومێد و تێکۆشان خرۆشاوە، ناوێکی نوێی لە ستوونەکانی هەرقل ناوە و، بووە بە قارەمانی ئەفسانەیی وڵاتانی ئەوبەری دەریا[١]. وە سەردارێکی گەنج کە بە باڵی ئومێد فڕیوە، یاریی بە چاخەکان کردووە و، گەیشتووە بە مەزنی و شکۆمەندییەك کە لە مێژووی مرۆڤدا کەم کەس چنگیان کەوتووە[٢].

بەتایبەت لەو کاتانەدا کە قەدی میللەت چەمیوەتەوە و، غرووری شکاوە، ئیمان و ئومێد حاڵەتێکی داستانئامێز وەردەگرن و، مرۆڤ بە ئەندازەی باوەڕەکەی، دەتوانێت سنگ لە هەموو گەردوون دەربپەڕێنێت و، ئەگەر هەزار جاریش بهەژێت و گلۆڵەی بکەوێتە لێژیی، هێشتا ڕێگای لێ ون نابێت و بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن. لە نەداریدا جیلوەی بوون پیشان دەدات و دەبێت بە گیان بۆ ڕۆحە مردووەکان.

١. مەبەست لێی تارق کوڕی زیادە.(وەرگێڕ)

٢. مەبەست لێی سولتان محمد فاتیحە.( وەرگێڕ)

بە یارمەتی ئومێد ڕێگا درێژەکان دەبڕڕێن، دەریای خوێن و زووخاوەکان تێدەپەڕێنرێن، هەر تەنها بە ئومێدیش زیندوویی و ڕێسا بەدەست دێت. ئەوانەی لە جیهانی ئومێددا دۆڕابن، لە ژیانی کرداریشدا بە بەزیو حسابن. چەندین کەس هەبوون کە مەردانە دەرپەڕیونەتە مەیدان، بەڵام پاش ماوەیەك بەهۆی کەمیی ئیمان و ئومێد، لە نیوەی ڕێگادا بەجێ ماون. بوومەلەرزەیەکی بچووك، زریانێکی کاتیی، لافاوێکی کورت، ئیرادە و دامەزراویی ئەوانی شکاندووە و ڕایماڵیوە. بەتایبەت حاڵی ئەوانە زۆر جەرگبڕە کە سەرەتا کەسانی تر پشتیان پێ بەستوون، کەچی لە کۆتاییدا ئەوانیش لەگەڵیاندا کەوتوونەتە زەلکاوی نائومێدییەوە!

لەڕاستیدا مەحاڵە ئەوانەی ڕاستییان نەدۆزیوەتەوە و دڵیان پێوەی نەبەستراوە، چارەنووسێکی تری بێجگە لەمەیان هەبێت. بێگومان ئەو کەسانەی ئومێدیان بە پلە و پایە و پێگە هەبووە و، دڵیان بە سەروەت و سامان بەخشیوە و، دڵیان بە شتانی فانی و کاتی خۆش کردووە، زوو یان درەنگ گیرۆدەی دۆڕان دەبن.

ئەو ڕۆحەی کە دڵبەستەی ڕەنگێکی کاڵ نەبوو و، ڕووناکییەکی هەمیشەیی و، خۆرێکی ئاوانەبووە، شەوی وەك ڕۆژ ڕۆشن و، ڕۆژەکانیشی مانەندی باخچەکانی بەهەشت ڕەنگاوڕەنگن. لە ئاسۆی ئەم جۆرە کەسانەدا کە تاریکیی ناناسرێت، خۆرەکان دێن و دەچن و، ئاڵوگۆڕی وەرزەکان، وەك پێشانگای سەرسووڕهێنەری دیمەنە جیاوازەکان یەك بەدوای یەکدا دێن. یان ئەوان هەریەکەیان وەك چنارێکی بەرز وان کە سەریان لە ئاسمانەکاندایە و، ڕەگەکانیشیان هێندە بە ناخی زەویدا ڕۆچووە کە نە هێزی زریان و لافاوەکان و، نە توندیی ڕەشەبا و بۆرانەکان

دەتوانن کاریان لێ بکەن. ئەم دڵانەی کە وابەستەی ئەبەدییەتن و سەرشارن لە ئومێد، گوێ بە بەهار و، هاوین و، خەزان و، زستان نادەن و لە هەموو وەرزێکدا پڕ بە باوەش میوە دەگرن و، هەمیشە ئەوەی لە باڵا شکۆدارەکەیان چاوەڕێ دەکرێت دەیهێننە جێ.

ئێمە وەکو نەتەوە پێویستمان بە فڵان و فیسار نییە، بەڵکو بەقەدەر ئاو و، هەوا و، نان پێویستمان بە کۆمەڵێك ڕێ نیشاندەری وایە خۆڕاگر و نەبەردن و، کۆڵنەدەر و چاونەترسن و، هەرگیز دووچاری نائومێدیی نابن. سەبارەت بەوانەش کە لەگەڵ هەوەسدا کەوتوونەتە ڕێ و، بەگوێرەی "هەوا"کانیان ئەوەیان دەست نەکەوتووە کە بەدویدا گەڕاون، یان دووچاری نائومێدیی بوون، یاخود کەوتوونەتە مشتومڕ لەگەڵ بەدیهێنەردا. ئەوان لە ئێمە و ئێمەش لە ئەوان فەرسەخ فەرسەخ دوورین. چونکە هەرگیز چەرخی فراوانی فەلەك بەگوێرەی فەلسەفەی بۆگەن و، ئەندازەی ناقۆڵای ئەم نەگبەتانەی سەر زەوی ناجووڵێتەوە..!

لەم ڕۆژانەدا کە هەزار و یەك چرۆی ئومێد پێدەکەنن و، هەزار و یەك تۆوی ئومێدیش لەژێر خاکدا چاوەڕێی توانەوەی بەفر و سەهۆڵبەندانن، ئومێدەواری هیواین بۆ ئەو دڵانەی کە بێبەشن لە ئومێد...

# ئاسۆی ڕۆح

# یان

# بیری میتافیزیکی

# ئاسۆی ڕۆح یان بیری میتافیزیکیی

بەدرێژایی چەندین ساڵ لەم وڵاتەدا ڕۆح و ئاسۆی ڕۆح بە بەردەوامیی بە بێمانا زانراوە و بە چاوی سووك تەماشا کراوە و سووکایەتی پێ کراوە. بەتایبەت هەمیشە لە لایەن هەندێك لە شەیدایانی ڕۆژئاوا و ئەوانەی خۆیان بە شۆڕشگێڕ دەزانن، لەژێر ناوی "گۆڕان" و "نوێبوونەوە"دا ڕۆح و میتافیزیك و هەموو ئەو شتانەی تریش کە پەیوەندییان بە ڕۆحەوە هەیە و، بە بناغە و ناوەرۆکی بوون و مانەوەمان دادەنرێن، بە بچووك سەیرکراون و دوژمنایەتییان لەگەڵدا کراوە.. چونکە ئەمانە هیچ دەربارەی ڕۆح و ئاسۆی ڕۆح نازانن. لەڕاستیدا ئەوانەی هەموو شتێك دەگێڕنەوە بۆ مادده و هەردەم دەیانەوێت بیرکردنەوە و بڕیارەکانیان لە چوارچێوەی فیزیکدا قەتیس بمێنێت، ئەستەمە لە ڕۆح و، میتافیزیك و، شتە مەعنەوییەکان تێبگەن. ئەوە هیچ کە لە ڕۆح و مەعنەوییەت حاڵی نابن، بەڵکو ئەزموونگەرە هاوچەرخەکان، تەنانەت ناتوانن بە ئەندازەی عەقڵگەراکانیش مادده و بوونەوەران ببین و هەڵیبسەنگێنن.. بەڵێ، ئەمانە لە ڕووی تەسەوور و جیهانبینییەوە هەتا بڵێی ڕواڵەتبین و،

لە ڕووی لۆجیك و بڕیاری عەقڵییەوە کاڵ و کرچ و، لە ڕووی شێواز و میتۆدیشەوە تا بڵێی سەرشێت و منداڵانەن.. ژێرییان بە جیهانی هەستەکانیان سنووردار بووە و، ئیلهامیان بە ماددە چواردەوری گیراوە و، ئاسۆی بیرکردنەوەشیان یەکجار تەسك و تاك ڕەهەندە.

لەبەر ئەوەی ڕۆح و مانا و میتا فیزیك بەراورد بە هەست و غەریزەکانمان داوای ئاسۆی فراوانترمان لێ دەکەن، بێگومان هەندێك لە ماددەپەرستە ڕووکەش بینەکان لێیان تێناگەن و، هەر لەبەر ئەم هۆیەش حەزی پێ ناکەن. بە مانایەکی تر ئەوانەی توانای تێگەیشتنیان لە ئاسۆی ڕۆح و میتا فیزیك نییە، هەوڵ دەدەن سنووری بیرکردنەوە و هێزی تێگەیشتنی مرۆڤ بچووك بکەنەوە. بەڵێ، ئەم مرۆڤانەی کە خاوەنی ڕۆحی گچکەن، کاتێك ڕۆح و مانا و میتا فیزیك دەخەنە دەرەوەی سنووری تێگەیشتنی ئادەمیزادەوە، هەلی دەرکەوتنیان وەك "ڕۆشنبیر" بۆ دەڕەخسێت. ئەمانە بە بەردەوامی دەم لەوە دەکوتن کە گوایا لەمێژە لە ئەورووپادا ئاسۆی ڕۆح و میتا فیزیك هەڵگیراون و فڕێدراون. لەوانەیە ئەمەش ببێت بە سەرچاوەی خەڵەتان بۆ ئەو کەسانەی شارەزای دیوی ناوەوەی بابەتەکە نین. تەنانەت لەوانەیە هەندێك ڕۆحی سەرگەردان کە کراوەن بەڕووی فەنتازیاکاندا بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. بەڵام ئەو بیرە زانستییەی -هەرچەندە لەسەر ماددەگەریش بنیات نراوە- کە یەکێکە لە بناغە گرنگەکانی دروستبوونی ئەم ئەورووپایەی ئێستا، هەرگیز بە یەکجاری ڕۆح و مانا و میتا فیزیکی پشتگوێ نەخستووە. ئەو، هەرچەندە نەیتوانیوە ڕۆح و مانا لەگەڵ فەلسەفەی ئەزموونگەرا و عەقڵگەرا بگونجێت، بەڵام هەرگیز نە بە تەواوەتی لە بیری ئەفلاتوونیی دوورکەوتووەتەوە و، نە چاوی لە

ئاستی پاسکالدا داخستووە و، نە توانیوشیەتی لە جیهانی مێتافیزیکیی بێرگسن بە یەکجاری خۆی بەدوور بگرێت.. بەڵێ، بەنزیکەیی لە هەموو سەردەمێکدا ئەم جۆرە بیرمەند و زانایانە وەکو بناغەیەکی سەرەکی لە بنیاتنانی ڕۆژئاوای ئەمڕۆدا ڕۆڵیان بینیوە و، ئەرکی دامەزرێنەریان پێ بەخشراوە. کەچی لە "گۆڕان" و "نوێبوونەوە"کانی ناو ئێمەدا ڕۆح و، ئاسۆی مانا و سەرجەم توانا و لێهاتنەکانی، وەك ئەوەی شمەکێکی کۆن و قەڵب بن، یان لە سووچێکدا فڕێدراون، یان سووکایەتییان پێکراوە و بە کەم تەماشا کراون و، لە لایەن تاقمێکەوە و لەژێر ناونیشانی "پێشکەوتن" و "بەڕۆژئاواییبوون" و "ڕۆشنبیری"دا کراون بە قوربانی کۆمەڵێك بەهای وەهمی و گوێرەیی کە خۆیان بە پیرۆزی دەزانن. کران بە قوربانی و هیچ شتێکیش لە جێگایان دانەنرا.

ئەگەر ئاسۆی ڕۆح کرانەوە بێت بەڕووی ئەودیو پەردەی بووندا و مێتافیزیکیش بریتی بێت لە هەڵسەنگاندنی بوون وەك "گشت"ێك و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لێی -کە بە گشتیی بەم شێوەیە پێناسە دەکرێن- کەواتە بە بێ ئەمانە نە دەکرێت بوونەوەران و ڕووداوەکان لە چوارچێوەی خۆیاندا و تەبا لەگەڵ ناوەرۆکیاندا تەفسیر بکرێن و بهێنرێنە سەر زمان، نە دەشتوانین لە ناوەرۆکی بەدیهاتن و، پەیوەندیی بەدیهێنەر بە گەردوون و، پێوەندیی ئێمە بە بەدیهێنەرەوە تێبگەین. چونکە زانستەکان بەگوێرەی لق و جۆرەکانیان، چەند بناغە و ڕێسایەکمان دەخەنە بەردەست و، هەریەکەیان بە یارمەتیی چەند شێواز و میتۆدێك ڕێگەمان دەدەن لێیان وردببینەوە و شیکاریان بکەین. ئەگینا هەرگیز ئەم پارچە لێکدابڕاوانەی زانست ئەو ئەنجامەمان نادەنێ کە چاوەڕێی دەکەین.. نەك هەر ناماندەنێ،

بەڵکو مانا و ناوەڕۆکی "بوون" بە تەواوەتی لەناودەچێت و، ئەو شتەش کە خستوومانەتە ژێر چاودێریی و لێ وردبوونەوەوە، تەنها بریتی دەبێت لە کۆمەڵێك وێنە و شێوەی بێگیان. لەبەر ئەوە ئێمە تەماشاکردنی "بوون" لەژێر وردبینی میتافیزیك و هەڵسەنگاندنی لەڕووی ئاسۆی ڕۆحەوە، بە تاقە ڕێگای تێگەیشتن و ناسینی فرەڕەهەندانەی ئەوی دەزانین. پشتگوێ خستنی ئەم ڕێگایەش بە زۆرکردن لە "لۆجیك" بۆ تێگەیشتن لە شتانێك کە لە دەرەوەی وزەی ئەودایە و، بە بەندکردنی "عەقڵ" لە فانۆسی شتانی هەست پێکراودا و، سنووردارکردنی بڕیارەکانی "ژێری" بە جیهانی هەستەکانەوە، دەزانین. کاتێکیش گوێ بۆ خودی خۆمان هەڵدەخەین و، دەنگی ڕۆحمان دەبیستین، دەبینین ویژدانمان بە توندی بەرپەرچی ئەم بۆچوونە دەداتەوە و شایەتحاڵی یاخی بوونی لۆجیك و عەقڵ دەبن لە هەمبەر بڕیارێکی لەو شێوەیەدا...

میتافیزیك و ئاسۆی ڕۆح لە بناغەدا کاریگەریی هەبووە لەسەر هەموو ئەو تەوژمە مەزنە فیکرییانەی کە هەتا ئێستا لە دنیادا دەرکەوتوون. لە دنیای کۆندا هەر لە سامییەکانەوە هەتا عیبرانییەکان، لە ئارامییەکانەوە هەتا تورانییەکان، لە تەوراتەوە هەتا ویداکان، لە ئوپانیشاتاکانەوە هەتا ئاوێستاکان و گاتارەکان.. لە دنیای نوێشدا هەر لە زەبورەوە هەتا ئینجیل، لە قورئانەوە هەتا سوننەت لە شەپۆلی میتافیزیك و لەژێر سایەی ئاسۆی ڕۆحدا گەشەیان کردووە و پێگەیشتوون. ئینکاری کردنی پاڵەوانانی میتافیزیکی وەك کانت و، هیگڵ و، لایبنز و، ژۆن، مانای بێناگابوونە لە ناوەڕۆکی جیهانی ڕۆژئاوای ئێستا.

ئەوانەی کە بیری زانستیی لەگەڵ ڕۆح و مانادا دەدەن بە

شەڕ، لە ڕاستیدا ئەوانەن کە نە لەمدیو پەردەی بوون و نە لەودیوی هیچ تێنەگەیشتوون و، لە سنووری نێوان فیزیك-مێتافیزیك سەریان دەرنەکردووە و، دەستەیەکی چاولێکەری وان کە بەهرەی بیرکردنەوە و توانای بڕیاری ژیرانەیان نییە. ئەمە لە حاڵێکدا کە هەموو جۆرەکانی زانست لە سەرچاوەی بیری مێتافیزیکیی و ئاسۆی ڕۆحەوە پەروەردە دەبن. بەدرێژایی مێژوو هەموو جووڵانەوە زانستییەکان بە مژینی ئەم کانیاوە گۆش بوون و، بیری زانستییش لە سایەی ئەو ئیلهامە فراوانەی کە دەڕژێنە دڵمانەوە و ڕەنگی ئەبەدییەتیان پۆشیوە، گەیشتوون بەم سەردەم و ڕۆژگارە.

ئەگەر ئەمڕۆش جارێکی تر لە خەیاڵی ئەوەدا بین کە لە هەرێمی ڕووناکی زانستدا دنیاکەمان سەرلەنوێ بنیاد بنێینەوە -کە بێگومان هەر واشە- تەنها بەوە دێتە دی کە بە یارمەتیی تێبینییە فراوانەکانی مێتافیزیك، لە ویژدانمانەوە تەماشای ئاسۆی ڕۆح بکەین. مەگەر هەر ئەمە هۆکاری ئەوە نییە کە لە ڕابردووی نزیکماندا سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونە، هێشتا نەمانتوانیوە لە نەتەوەکەماندا نە عەشقی زانست و، بیری زانستیی و، نە فەلسەفەیەکی زانست بەپێی ستانداردەکانی ڕۆژئاوا دابمەزرێنین؟! نەمانتوانی، چونکە عەشقی حەقیقەت و زانست و، بیری زانستییمان نەخستە دڵی نەوەکانمانەوە.

ئەمڕۆ ئەو بناغانەی کە لە زانستە هەمەجۆرەکاندا بەکاریاندەهێنین و، ئەو جیهانبینییەش کە هەمانە سەبارەت بە ژیان و گەردوون و بوونەوەران، بریتین لە چەند بیردۆزێك کە پێشتر لە لایەن کەسانی ترەوە خراونەتە ڕوو.. تۆوەکانی ئەمانە هەرگیز بەرهەمی لۆجیکی ئێمە و، بڕیاری

عەقڵیی ئێمە و، هەوڵی ئێمە و، شەونخونیی ئێمە نین. هەستان بە سوود وەرگرتن لەو شتانەی کە ئازار و ژانی فیکریمان پێوە نەچەشتووە و، خەوی نەزڕاندووین و، بەرهەمی هەنسك و ماندووبوونەکانی ئێمە نین -بەتایبەت ئەگەر ڕاستەوخۆ و بێ دەستکاری کردن و گونجاندن بێت- توانای زایینی ڕۆحمان دەکوژێت و ژیانی فیکریمان دەخەسێنێت.

بیری زانستیی ڕاستەقینە و، وردبوونەوەی میتافیزیکیی و، ئاسۆی ڕۆح ئەو بیرەیە کە لە بەرامبەر هەر پارچەیەکی بووندا و لە هەمبەر هەر یاسایەکی گەردوونیدا، هەمیشە جیهانبینییەکی گشتگیر و تەفسیرێکی گشتیمان دەداتێ و، ئەو پارچە بچووکە یان ئەو یاسا هەندەکییە دەبەستێتەوە بە تێکڕای گەردوونەوە. چونکە ئەو کارلێکێکی ئەفسووناوییە و لە "بەش"ەوە دەمانبات بۆ "گشت".. بەڵێ، لە کاتێکدا ئەو ئیلهام و تێگەیشتنەی کە "بەش" دەیبەخشێت هەندێك جار سەر بۆ نادیاریی و بێمانایی دەکێشێت، کەچی لە بەرامبەردا "گشت" بە بەڵگە دادەنرێت لەسەر کەماڵی خۆی.

میتافیزیك و ئاسۆی ڕۆح لە هونەریشدا دارای گرنگییەکی یەکجار مەزنن. تەنانەت دەتوانرێت بوترێت کە بەرهەمێکی هونەریی تەنها لە سایەی ئەم ئاسۆیەدا دەتوانێت ڕەنگ و قووڵیی خۆی دەربخات. چونکە ئەو کارەی هونەرمەند دەیکات بریتییە لە چاودێری کردنی پەیوەندیی نێوان هەستە ناوەکییەکانی مرۆڤ لەگەڵ گەردووندا و، دەربڕین و هێنانە سەر زمانی ئەو هەست و نەست و هەیەجانەی کە لەناو ئێمەدا دێتە کوڵ و، پاش دەربڕینیان لە شێوەی چەند پێکهاتەیەکی گونجاودا پێشکەشمانی دەکات، لەم ڕێگەیەوە وێنەی ئەو ڕاستییە دەکێشێت کە

هەموو شتێکی ناو سروشتی ئێمە بەرەو سەرچاوە بنەڕەتییەکەی خۆی پەلەقاژەیەتی. بە واتایەکی تر هونەرمەند لە بەرامبەر هەر توخمێکی بوونەوەران یان ڕەنگێکی گەردووندا، ئەو شتانەی دەڕژێنە هەستەکانیەوە و ئەو ئیلهامانەش کە ڕۆحی باوەش دەکەن، تێکەڵاو دەکات و، پێکەوە گرێیان دەدات و، هونەرمەند ئەو پاڵەوانەی بواری مێتافیزیکە کە بە کۆکردنەوەی هەموو نۆمین و فینۆمینەکان، هەموو شتێك لە شێوەی "گشت"ێکدا پێشکەش بە ئێمە دەکات.

بەڵێ، هەستە پارچە پارچەکان، هەروەك نابن بە کانگای بیرێکی زانستیی ڕاستەقینە، مەحروومیشن لە بەخشینی ئیلهامی ئاسۆیەکی ڕاستەقینەی هونەریی. پێدەچێت کەموکورتیی و، نەگونجاویی و، چەق بەستوویی و، بێ زەوقی و، بێ تامیی و لاسایی کردنەوە کە باڵیان کێشاوە بەسەر بیری هونەریی ڕابردووی نزیکماندا، لەم جیهانبینییە کورت و تەسکەوە سەری هەڵدابێت.. بەڵێ، ئەگەر ئاسۆیەکی ڕۆحمان نەبێت کە وەك ڕوانگەیەك وایە بۆ تەماشاکردن و، موتاڵا کردن و، نرخاندنی هەموو بوون وەکو "گشت"ێك، نەك هەر ناتوانین بلیمەت لە بواری هونەردا پێبگەیەنین، تەنانەت ناشتوانین لە ڕێگەی هونەرمەندانی ئاساییەوە بگەین بە ئاسۆیەکی دڵخۆشکەر لەم ناوەندەدا.

جارێکی تریش ئەو ڕاستییە یاد دەخەینەوە کە گرنگترین سەرچاوەی زانست و، جیهانبینیی و، هونەر و، تەنانەت فەزیلەت و، ئەخلاق و، کلتووریش ئەو فەلسەفە ڕاستەقینەیەی مێتافیزیکە کە لە ڕێگای ئاسۆی ڕۆحەوە بەدەست هاتووە. بە یارمەتی فەلسەفەیەکی لەم جۆرە کە لە کێڵگەی فیکریی خۆماندا گەورە بووە، پارچە شکاوەکانی زانیاری

حاڵەتی "گشت"ێك وەردەگرن و، هەموو شتێك هەر لە بازنەی لاهووتەوە هەتا ئەوپەڕی سنووری بازنەی مومکینات بە هەستێکی ماهووتییانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و، بەهۆی ڕاڤەی نوێوە دەرفەتی کرانەوەی فراوانتر دێتە گۆڕێ.

لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین ئەو نەتەوانەی ئاسۆی ڕۆحیان نییە و، هەر بۆیە نەشیانتوانیوە سیستەمێکی میتافیزیکیی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن، هەرگیز لە چاولێکەریی ڕزگاریان نابێت و، نابن بە خۆیان و، هەست بە خاوەندارێتیی هیچ شتێکیش ناکەن. هەمیشە لە سەرگەردانیدا تاوێك بۆ ئەملا و تاوێك بۆ ئەولا دەڕۆن.. جاری وا هەیە سواڵ لە کەسانێك دەکەن کە بە "ئەوانی تر" ناوزەدیان کردوون، جاری واش هەیە لە کەسانی تر.. بەڵام هەردەم لێدانی دڵیان نارێکە.. وە تەنها کەلاوەیەکی "ڕۆیشتنی زیکزاکیی" وەك میرات بۆ ئەوانەی دوای خۆیان جێدەهێڵن. بەڵێ، لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ ئەو نەتەوانەی نەیانتوانیوە بە یارمەتیی بیرێکی میتافیزیکیی باش کەسایەتیی خۆیان دابمەزرێنن و، ئەو کۆمەڵگایانەش کە ڕۆحیان بە قەیرانی ناسنامە پارچە پارچە بووە، لە کۆتایی ڕێدا ناچاربوون ئینکاریی خۆیشیان بکەن.

چاولێکەرییەکانمان بۆ ماوەی چەندین سەدە، ئەو نەبوونی بڕیار و دانەمەزراوییەش کە لەم لاساییەوە سەرچاوەی گرتووە، هەم ئێمە و، هەم ئەو نەوانەی پەروەردەمان کردوون و، هەم ئەوانەی دوای خۆیشمانی دووچاری سەرسامیی کردووە و، بەرەو مەیدانێك کە بۆچوونە جیاوازەکان تیایدا لە جەنگدان پاڵمان پێوە ناون و، تاکەکانی نەتەوەمان کردووە بە گورگی یەکتری.

هەنووکە ئێمە چاومان لە ئاسۆ بڕیوە و چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو پاڵەوانی ئیرادانەین کە نەتەوە لە بێباوەڕی و، دانەمەزراویی و، بێ بڕیاری و، چاولێکەریی ڕزگاردەکەن، ئەو قارەمانی ڕۆحانەی کە دوێنێ و، ئەمڕۆ و، سبەی لە یەك خاڵدا دەبینن و هەڵیدەسەنگێنن و، شادمان دەکەن بە سیستەمی مێتافیزیکیی خۆمان و، هونەری خۆمان و، ئەخلاقی خۆمان.

# شەیتان و
# شوێنکەوتە هاوچەرخەکانی

# شەیتان و شوێنکەوتە هاوچەرخەکانی

شەیتان بوونەوەرێکی چارەڕەشی نەفرەت لێکراوە، کارەکەی بریتییە لە ئارەزووپەرستن و دڕندەیی و، لە چوارچێوەی فیتنە و، خراپەکاریی و، دووڕوویی و، دووبەرەکیشدا بەردەوامیی بە بوونی دەدات. کاری ئەو شەیتانێتییە و هەمیشە بەدوای شەڕدا ڕادەکات. هەستە خراپەکان لە مرۆڤەکاندا دەوروژێنێت و، بە دوورخستنەوەیان لە باشی و جوانی و فەزیلەت دەیانچوێنێت بە خۆی و، دەیانکات بە ئاوێنەی خۆی. ئەو شتانەی کە زۆر گرنگییان پێ دەدات و خۆی پێیانەوە سەرقاڵ دەکات بریتین لە یاخیبوون بەرامبەر فەرمانە ئایینییەکان و، هەڵگەڕاندنەوەی فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) و، شیرین کردنی ڕێگای قەدەغەکراوەکان لەبەر چاوان و، پاڵنانی خەڵکی بەرەو ژیانی ئاژەڵانە. ئەو، هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکدا، گوێ نەدان بە یاسا و ڕێسا لە دڵی شوێنکەوتووانیدا دەچێنێت.. هەڵپەی ئەم جۆرە کەسانە تاو دەدات، قامچی لە ئارەزووە جەستەییەکانیان دەوەشێنێت،

هەردەم ڕێگای دزی و تاڵانیان نیشان دەدات، بە تام و چێژەکان فریویان دەدات و، سیفەتی ئیبلیسێتیی دەگوازێتەوە بۆ زۆرێکیان.

هەندێك لەو هەستانەی کە لە چوارچێوەی چەند بەرژەوەندی و حیکمەتێکی دیاریکراودا لە بوونی مرۆڤدا دانراون، ئەو لە خراپ بەکارهێنانی ئەمانەدا وێنە و نموونەی نییە.. ئەو، سەبارەت بەو بەدبەختانەی چوونەتە ناو هەرێمە پیسەکەی ئەوەوە، هەتا بڵێی کارامەیە لە بواری پیشاندانی شتانی جوان وەك ناشرین و شتانی ناشرینیش وەك جوان. ئەو چارەڕەشانەی ڕاوی کردوون، بە یارمەتی شێوازەکانی خەواندن و پڕوپاگەندەکانی، بە جۆرێك دەیانکات بە کۆیلەی جەستە، جارێکی تر زۆر ئەستەمە ئەمانە بەرزببنەوە بۆ ئاسۆی مرۆڤی ڕاستەقینە...

هەرچەندە ئادەمیزاد لەو کاتەوە ئەم بوونەوەرە زیانبەخشە دەناسێت، کە لە ڕووداوی سوجدە بردن بۆ ئادەمدا لە خوای گەورە یاخی بوو، بەڵام پێدەچێت سەرگوزەشتەی ئەم بەدبەختە -خوا باشتر دەزانێت- لە ڕووی کێشەکانی ناخی و، دژیەکیی ناو بیرکردنەوە و هەستەکانی، بگەڕێتەوە بۆ زۆر لەوە پێشتر. ئەو بەو سیفەتانەی کە وەکو ماتەوزەیەك لە سروشتیدا دانراوە چەشنی هەستی ئێرەیی و، فریودان و، خۆپەرستیی و، یاخی بوون و، حەزکردن لە ناوبانگ -لە هەموو ئەمانەدا ئیرادە جوزئییەکەی وەك هۆکارێکی ئاسایی حسابی بۆ کراوە- ڕێك وەك شوێنکەوتەکانی لەم ڕۆژگارەدا، بوونەوەرێکی هێندە نزم و بێنرخە کە هەردەم ڕۆحی بە یاخیبوون و سەرهەڵدان قوڵپ دەدات و، خۆی بۆ خراپە و خراپکاریی یەکلایی کردووەتەوە. چونکە لەو ماکە سەرەکییانەدا کە ماهییەت و دنیای ناوەوەی ئەو پێکدەهێنن هەمیشە هەستە خراپەکان هەڵدەقوڵێن،

هەمان شتیش دەدات بە گوێی هەموو ئەو ئینس و جینانەدا کە تێکەڵی خولگەی ئەو دەبن. بە تایبەت هەوڵ دەدات ئەوانەی کێشەی کەسایەتییان هەیە بیانچووڕێنێت بە خۆی و بە بەردەوامیی فووی شەیتانیی دەکات بە ڕۆحیاندا.. لە خوێن و دەمارەکانیاندا دێت و دەچێت.. وە هەمیشە شتی خراپ دەچپێنێت بە گوێی ئەم چارەڕەشانەدا. ئەم داماوانە ئەو وتە و دەربڕینانەی کە لە جیهانی ناوەوەیاندا شێوە دەگرێت یان ئەو بیرکردنەوە چەپەڵانەی کە لە شێوەی نووسیندا دێنە دەر، وا دەزانن هیی خۆیانە، کەچی لە ڕاستیدا بوونی نەقیزە شەیتانییەکان لە پشتی ئەم شتە خراپانەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە. لەم ڕووەوە ئەو شەیدایانەی شەیتان و ئەو دەستە و تاقمانەی فیتنە و ئاژاوەش کە بە تایبەتی ڕق و قینیان بەرامبەری بە ئەهلی ئیمان هەڵگرتووە و، هەوڵی فریودانیان دەدەن و، جاروبار هەستە ئاژەڵییەکان لە هەندێك لە لاوازەکاندا دەوروژێنن و بەرەو ژیانی ماددی ڕاپێچیان دەکەن و، هێرش دەکەنە سەر ئەو کەسانەی کە وەك خۆیان بیرناکەنەوە و، ئاژاوە و قەیران دەنێنەوە و هەوای گشتیی تێکدەدەن و، چینە جیاوازەکان دەکەن بە گژی یەکتردا و، هەمیشە وێڵن بەدوای دووڕوویی و دووبەرەکیدا و، وەکو قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ دەکات کاتێك لەناو ئیمانداراندان وەك یەکێك لەوان دەردەکەون و، کاتێکیش دەگەڕێنەوە بۆ لای ئاغا بێباوەڕەکانیان بیرکردنەوەی ڕاستەقینەی خۆیان ئاشکرا دەکەن.. بەڵێ، ئەم تاقم و پێڕانەش لە ڕووی مەجازەوە وەك شەیتان حسابیان بۆ کراوە، ئەمانە ئەو شەیتانەن کە ئایەتی پیرۆزی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾

(الانعام: ١١٢)[١]

ئاماژەیان بۆ دەکات.

ئەو شەیتانەی کە فەرمانی سوجدەبردنی بۆ ئادەم بەجێنەهێنا و ئاڵای سەرپێچیی هەڵکرد، لەوەش زیاتر سنووری خۆی بەزاند و، کەوتە موجادەلە و موناقەشە لەگەڵ خوای گەورەدا، ئەمێستا شوێنکەوتە مۆدێرنەکانیشی بە شوێنەواری ئەودا دەڕۆن و، هەموو کاتێك جەنگ لە دژی باشی و جوانی ڕادەگەیەنن و، هەوڵی لەبیربردنەوەی خوا و پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەدەن و، زەمینە بۆ سەوزبوون و گەشەکردنی بیرکردنەوە شەیتانییەکان ئامادە دەکەن. وەك گۆتە لە کتێبی فاوستدا ئاماژەی بۆ دەکات[٢]، لە دێر زەمانەوە تا ئەمڕۆ کێبەرکێی نێوان مرۆڤ و شەیتان بەردەوامە و، جەنگی نێوان ئیمان و کوفریش نە تەواو بووە و نە تەواو دەبێت... لە چوارچێوەی ئەم کێبەرکێیەدا جاری وا هەبووە زەمینە بۆ کوفر و گومڕایی خۆش کراوە و، بێباوەڕان بە تەواویی پێیان لێ ڕاکێشاوە، کاتی واش هەبووە باوەڕداران بە زەبری هێز سەرکوت کراون و، جاری واش هەبووە هەندێك ڕۆحی سەرگەردان جگە لە خۆیان

١. واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بە نهێنی بەیەکتری ڕادەگەیەنن وتەی ڕازاوە و بریقەدار بۆ فریودانیان، وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوەیان نەدەکرد، دەلێیان گەڕێ بە خۆیان و ئەو درۆیانەوەی کە هەڵی دەبەستن.

٢. شاتۆگەری "فاوست" یەکێکە لە کتێبەکانی نوسەری ئەڵمانیی بەناوبانگ "گۆتە"، تیایدا باس لە چیرۆکی کەسێك دەکات بە ناوی دکتۆر فاوست کە ژیانی بۆ زانست و پەرستنش ترخان کردووە و گەیشتووە بە تەمەنی پیری. ڕۆژێك شەیتان فریوی دەدات و لەبەرامبەر نیهانەکەیدا پەیمانی پێدانی سەرجەم جوانی و خۆشییە دنیاییەکانی پێدەدات. (وەرگێڕ)

مافی ژیانیان بە کەسی تر ڕەوا نەبینیوە و، جاری واش هەبووە -وەك لەم سەردەمەی خۆماندا چەندین نموونەی ئەمە دەبینین- ئای چ زوڵم و ناحەقیی و ستەمێکی دڕندانە کراوە!.. ئەم ستەمکارانە بیریان لە "قودرەتی قاهیر"ێك نەکردووەتەوە کە لەوان بەهێزترە.. بیریان لەوە نەکردووەتەوە ئەگەر ستەمکار ستەمی هەبێت، ستەملێکراویش خوای هەیە، ئەوانەی ئەمڕۆ دەستدرێژیی و ستەم دەکەن سبەی ڕووڕەش دەبن و، دەکەونە ژێر پێی خەڵك. ئەوەی لەمەش تاڵترە ژیانی ئەو بەدبەختانەیە کە لە ژێر سایە و فەرمانی ئەم ستەمکارانەدا بەسەری دەبەن، بڵێی هیچ لە دنیا و ڕووداوەکانی پێشین تێنەگەیشتبن؟ بەڵێ، هیچ تێنەگەیشتوون و خزمەتیان بە ئارەزووەکانی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانیان کردووە. هەستیان بەوە نەکردووە کەوتوونەتە چ حاڵێکەوە و بۆ چ کارگەلێکی قێزەون ڕاپێچ کراون. دەربارەی ئەمانە چەند خۆش وتوویەتی نامیق کەمال:

"موعینی زاڵمان لە دنیادا ئەربابی دەنائەتن

کەسێ حەزی لە خزمەتی ڕاوچیی بێویژدان بێت سەگە."

لەڕاستیدا کۆتایی ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە بەئازار و تاڵ بووە و ئەمڕۆش هەر وایە. پێشینانمان دەڵێن "دۆستایەتیی شەیتان تا پەتی سێدارەیە." چارەنووسیی ئەمانەش هەر ئاوا کۆتایی دێت. ئەمانە هەروەك لە دنیادا پێنەکەنیون، هەرگیز لە داهاتووشیان دڵنیا نین. ناتوانن دڵنیا بن، چونکە شەیتانەکانی ئینس و جینن ڕۆحی ئەوانی دزیوە.. بەڵێ، ئەوان جارێکی تریش دووچاری هەمان یارییە نەگریسەکەی شەیتان هاتوون.. خەڵەتابوون بەو دوژمنانەی لە شێوەی دۆستدان، بەو بێگانانەی وایان زانیبوو لە خۆیانن.

هەنووکە ئەو بێباوەڕ و، مولحید و، ئاژەڵ و، شەهوەتباز و، ستەمکارانەی کە حەق و دادپەروەریی ناناسن ئەوە دەکەن دەرهەق بە خەڵکانی بێچارە و هەژار کە تەنانەت شەیتانەکانیش نەیانتوانیوە بیکەن. بە جۆرێك ئەم تۆڕ و پێڕانەی شەڕ کە بیرکردنەوەیان تا بڵێی چڵکن و، دەمیان پیس و، ڕق و قین لە سنگیانەوە هەڵدەقوڵێت، هەردەم هێرش دەکەنە سەر ئەوانەی کە وەك خۆیان بیرناکەنەوە و، ناوی هەموو کەسێك دەزڕێنن و، هەر کەسێکیان بوێت دەیبەن بە ئاسماندا و، حەزیان لە هەر کەسێکیش نەبوو دەیبەن بە ناخی زەویدا. بەڵێ، ئەمە یەکەم ڕۆژ ئاوا بوو.. دوێنێش ئاوا بوو.. ئەمڕۆش هەر وایە..

خوای گەورە بانگی کردووین بۆ دووركەوتنەوە لە ئەو:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ * إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾

(البقرة: ١٦٨- ١٦٩)[١]

خوای گەورە ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی ئەم نەفرەت لێکراوە چاوەڕێی تۆڵە سەندنەوە لێمان:

---

١. واتە: ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی کە لە زەویی دایە بەحەڵاڵی و پاکی وە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە" بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێ دەدات بەتاوان و خراپە لەگەڵ هەڵبەستنی شتی وا بەدەم خواوە کە نازانن.

﴿ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا * وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴾

(النساء: ١١٨- ١١٩)[١]

بە فەرمانی:

﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ * ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾

(الأعراف: ١٦ - ١٧)[٢]

**بانگهێشتی کردووین بۆ لای وریایی و لەسەرخۆیی بەرامبەر بەو ڕق و قینەی کە شەیتان دەیچێنێت. خۆزگە دەمانتوانی لە هەموو ئەمانە تێبگەین!..**

١. واتە: کە خوا نەفرینی لێ کردووە، وە(شەیتان) وتویەتی سوێند بێت هەڵ دەبژێرم(بە بەندەی خۆم) لە بەندەکانت دا بەشێکی دیاری کراو *سوێند بێت گومڕایان دەکەم و بە ئاوات و خەیاڵی درۆینە سەرگەرمیان دەکەم، وە فەرمانیان پێ دەدەم جا بێگومان ئەوانیش گوێچکەی ئاژەڵەکان دەبڕن وە فەرمانیان پێ دەدەم ئەوسا ئەوانیش دروست کراوی خوا دەگۆڕن وە هەر کەسێك شەیتان بکات بە دۆستی خۆی بێجگە لەخوا ئەوە بێگومان زیانی لێ کەوتووە بە زیانێکی دیارو ئاشکرا.

٢. واتە: وتی ئەی پەروەردگار بەهۆی ئەوەوە کە گومڕات کردم بێگومان بۆیان (ئادەم و نەوەکانی) دادەنیشم لەڕێگە ڕاستەکەی تۆدا *ئینجا سوێندبێ بێگومان بۆیان دەچم لە پێشیانەوە و لەدوایانەوە، وە لەلای ڕاستیان و لەلای چەپیانەوە ئەوسا نابینی زۆربەیان سوپاس گوزار بن.

# مرۆڤ لە ئاسۆی
# لوتکەکاندا

# مرۆڤ لە ئاسۆی لوتفەکاندا

هەموو چرکەیەکی ژیان بریتییە لە چەند دەرفەتێك بۆ دەست خستنی گەنجینەی جیاواز و نوێ. قۆزتنەوەی ئەم دەرفەتانە و ژیان لە ڕووناکیدا یاخود لەدەستدانیان و مانەوە لە تاریکیدا -لەو ڕووەوە کە مرۆڤ شەرەفمەند کراوە بە توانای هەڵبژاردنی ئازاد- بەجێهێڵراوە بۆ خودی مرۆڤ خۆی.

لە پێش هەموو شتێکەوە خودی ژیان یەکێکە لەو نیعمەتە هەرە گەورانەی کە بە مرۆڤ بەخشراوە. هاتنە ژیان یان نەهاتن، بوون بە مرۆڤ یان نەبوون لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە، بەڵام مافی بەکارهێنانی ئەم دوو نیعمەتە ئەفسووناوییە و، سوود وەرگرتن لێیان و، بەدەست هێنانی بەختەوەریی لە هەردوو دنیادا، دیارییەکی خواییە و بەخشراوە بە ئیرادەی مرۆڤ.

فەتح کردنی ژیان و ئامێر و کۆئەندامەکانی تایبەت بە ژیان لە چوارچێوەی یاسا و دەستوورەکانی بەدیهێنەردا و، ناسین و، بوون بە خاوەنیان و، پاراستنیان، ئەمانە هەریەکەیان ئەرکێکی مەزنی سەر شانی

ئێمەن. مرۆڤ بە هەموو توانا و لێهاتن و بەهرەکانیەوە هێشتا لە مەڕمەڕێکی خاو دەچێت. هەروەك پەیکەرتاش بەگوێرەی نەخشەی ناو خەیاڵ و بیری خۆی مەڕمەڕەکە دەبڕێت و شکڵ و شێوەیەکی تایبەتیی پێ دەدات، بە هەمان جۆر مرۆڤیش وەکو پەیکارتاشی ڕۆحی خۆی وایە، دەتوانێت بە گوێرەی ئەو نەخشە و پلانەی کە بۆی دەنێرڕێت، بوونێکی دووهەمی پێ ببەخشێت و، دەتوانێت نهێنیی ناو ویژدانی خۆی لە سیمای ئەودا وێنا بکات. ئەوەندە هەیە پێویستە ئەو مرۆڤەی کە هاوشانی کتێبی گەردوونە و، ئاوێنەیەکی خاوەن هەست و شعوورە بۆ حەقیقەت، بتوانێت نووسراوە نهێنییەکانی ناو قووڵایی ویژدانی خۆی بخوێنێتەوە و، بە هیممەتێکی بەرز، هەرگیز لە گەڕان بەدوای باشترین و جوانتریندا دوا نەکەوێت. لەبری سەرکەوتنە کورت و کاتییەکان، هەوڵی هێنانە دی ئامانجە باڵاکان بدات. لەبری ئامانجە بچووکەکان بەدوای مەبەستە مەزنەکاندا ڕابکات. لەبری خۆ سەرقاڵ کردن بە بیر و خەیاڵە سادەکان، مەشغوڵی فیکرێك بێت کە سەری بهێنێتە ژان و خوێن لە لاجانگەکانیدا پل بدات! لەبری خوێندنەوەی هەر شتێك بەر دەستی بکەوێت، چەند بەرهەمێکی جددی موتاڵا بکات کە ئەم دنیا و ئەو دنیای بۆ ئامادە دەکەن و، ڕۆحی پێدەگەیەنن...

ئەو ڕۆحە کاڵ و کرچەی کە نەیتوانیوە دڵ بە ئامانجە بەرزەکان بدات و، خۆی بەگوێرەی مەبەستە مەزنەکان ڕێکبخات و، لە کەشوهەوای تاریك و پڕ لە دژایەتیی بیرۆکە سادەکان ڕزگاری نەبووە و، لە ڕێگەی ئەو شتانەوە کە دەیبینێت و دەیبیستێت و دەیخوێنێتەوە و بیریان لێ دەکاتەوە، نەیتوانیوە بگات بە تازەگەریی و، دەستەوەستان بووە لە ئاست

خۆش کردن و تاودانی ئاگری خۆشەویستی و شەوقی ناخی بەرامبەر بە مرۆڤەکانی تر.. بەڵێ، ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەگەر لە ژیانیشدا بن بە زیندوو حساب نین.

مرۆڤ وەك جێنشینی بەدیهێنەری مەزن بۆ ئەوە ڕەوانەی دنیا کراوە تا کاری مەزن ئەنجام بدات و بەرهەمی بەنرخ بهێنێتە مەیدان. ئەگەر ئەو هۆشیار بێت بەرامبەر بەم لێپرسراوێتییەی، ئەوا دەچێتە ناو بوونەوەران و ڕووداوەکانەوە و، دەستیان تێوەردەدات و، هەموو ڕۆژێك بە یارمەتی کۆمەڵێك پێکهاتن و شیکاری جیاواز، بەرهەمی هونەریی نوێ و تازە دەهێنێتە گۆڕێ.. کاتێکیش هەموو ئەمانە ئەنجام دەدات، هەموو چرکەساتێك لە ڕوخساری ئیرادەی خۆیدا ئیرادە و توانای ڕەهای خوای گەورە دەبینێت و، بە لارەملییەوە سوپازگوزاریی خۆی پێشکەش دەکات.

هەموو ئەو شتانەش کە پێویستن بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانبەرییە مەزنە پێشتر پێی بەخشراوە: "ئیرادە و هەیەجان" بۆ بەرزبوونەوە بۆ ئاستی مرۆڤێتیی، "حەزی فێربوون و عەشقی جوانیی" بۆ ناسین و خۆشویستنی گەردوون و بوونەوەرانی ناوی، "ویژدان" بۆ ڕاستڕەویی و دادپەروەریی، "دڵ" بۆ گرێدانی پەیوەندیی لەگەڵ بووندا، "ژیری" بۆ بەکارهێنانی ئەم نیعمەتانە لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا و، تا ڕادەیەك جیاکردنەوەی چاکە و خراپە، لە کۆتاییشدا شەماڵەکانی "وەحی" تا بتوانێت سەرجەم ئەم کاروبارانە بێ لادان و کەموکورتیی ئەنجام بدات...

ئەم مرۆڤەی کە بەم هەموو لوتفە ماددی و مەعنەوییە سەرفراز کراوە و ڕەوانەی جیهان کراوە، بێگومان لەناو بەدیهاتوواندا وێنە و نموونەی نییە و هەتا بڵێی دانسقەیە. بەڵام کاتێك ئەو ناتوانێت سوود لەم

دیاری و بەخششانەی بەدیهێنەرەکەی وەربگرێت، بەرەو خواری خوارەوە تلێر دەبێتەوە و، لە نزمترین بوونەوەریش زیاتر نزم دەبێتەوە.

لەم ڕووەوە ژیان خەرمانێکی وایە کە بەشی یەکەمی لوتف و ئیحسانە و، بەشی دووەمیشی بە ئیرادە و، نەخشە و، هەستیاریی لە هەمبەر فەرمانەکانی خوادا، شەن و کەو دەکرێت. بەڵێ، لە سایەی ئەو شتانەدا کە پێشتر پێمان بەخشراون، هەموو کاتێك دەگونجێت بە ئیرادە و هەست و لێپرسراوێتیمان هەڵیان بسەنگێنین و، ژیانمان دەوڵەمەند بکەین و، بە یارمەتی فەزیلەت و ڕەزامەندیی خوایی بیکەین بە نەمر و، لەناو شەپۆلی بەپیت و زیندووی کاتدا ڕەهەندی نوێی بۆ زیاد بکەین.

هەموو جۆرەکانی سەرکەوتن بە نسیبی ئەو بەختەوەرانە دەبێت کە دەستوور و ڕێساکانی ئەم ڕێگایە دەناسن و، بەپێی ئەمانە ڕەفتار دەکەن و، هەلومەرجەکانی سەردەمی خۆیان دەزانن و، بێ وەستان برەو بە کار و تێکۆشان دەدەن. بەڵام نەزان و، هەڵەشەکار و، دواکەوتوو و بەتایبەت ئەوانەی کە لە ڕۆژگاری خۆیاندا نامۆن هیچ گریمانێك نییە کە هیچ جۆرە سەرکەوتنێك تۆمار بکەن.

ئەو کەسانەی هەموو ڕۆژێك بە بەهارێکی نوێ دەزانن و، بەردەوام تۆو بە دەوروبەریاندا دەچێنن و، هەموو سپێدەیەکیش وەکو دەرگای گەنجینەیەکی پڕ لە پیت و بەرەکەت دەبینن و، هەوڵ دەدەن بەهۆی سوود وەرگرتن لە یەکەمین بەخششە خواییەکانی بەری بەیان ئەو دەرگایە بکەنەوە، ژیانیان دەگۆڕن بە گوڵگەنمێکی حەوتبار و، لە ڕۆحیاندا دەگەن بە نەمریی.

# ژیانی موسڵمانانە

هەموو سیستەمێکی مرۆیی و جیهانبینییەکی مرۆیی چەند تەمەنیشی درێژ بێت دیسان بە تێپەڕبوونی کات کۆن دەبێت و، ماوەی بەسەردەچێت و، سەرنجڕاکێشیی و جوانییەکەی لەدەست دەدات و، بێزاریی لە مرۆڤدا بەرهەم دەهێنێت. بەڵام ژیانی موسڵمانانە و جیهانبینیی موسڵمانانە وا نییە. مرۆڤ لەودا -ئەگەر بەتەواوەتی ڕۆحی خۆی ئامادە کردبێت- لە سەروو ئەو شکڵ و شێوانەوە کە پێیان ڕاهاتووین، وەك ئەوەی لە بەهارێکی ڕازاوەدا بین، هەست بە درەوشانەوەی جوانی و سەرنجڕاکێشیی دەکات لە ناوچەوانی کتێبی گەردووندا و، بیرۆکەی نەمریی لە هاژەی تاڤگەکاندا دەبینێت و، لە قووڵایی ئاسمانی شینیشدا هەستی ئەبەدییەت دەدۆزێتەوە و، دەڵێی سەری گەیشتووە بە بەهەشتەکان.

لەدایکبوون بە موسڵمانێتیی و گەورەبوون لە باوەشیدا و هەستکردن و چەشتنی شێوازە تایبەتەکەی ئەو بە ڕۆح، بریتییە لە بەختیاریی و چارەنووسێکی گەش. ئەوانەی کە هەلی ناسینی کەشوهەوا نەرم

و ڕووناك و پڕ بەرەكەتەكەی ئەویان دەست نەكەوتووە، وەك ئەو كەسە تەنهان كە بەدرێژایی تەمەن لە خۆشەویستەكەی مەحروومە و، لەم دەشت و دەر بۆ ئەو بیابان و هەرد وەك سەرگەردانێك ڕادەكات.. بەدەم وتنی "دیدە گریان، سینە پەرێشان، عەقڵ حەیران"ەوە گاهـ هاواری "شیرین" دەكات و دەكڕووزێتەوە، گاهـ نائومێدانە بانگی "لەیلا" دەكات.. نووری چاوی دەكوژێتەوە و هێز لە ئەژنۆیدا نامێنێت، بەڵام كاتێك لە ئەنجامدا دەڕوانێت بەقەدەر دەنكە گەنمێك ڕێگای نەبڕیوە.. بۆی دەردەكەوێت كە بە خۆی و خەیاڵ و خولیا و خۆزگەكانیەوە، بە پێی خاوس و سەری قۆتینەوە، لە هەمان جێگای خۆیدا چەقیوە و، بە حەسرەتەوە دەناڵێنێت.

جاری وا هەیە كەسێك بێئاگا لە هەموو شتێك دەكەوێتە ڕێ، پاش ماوەیەك بە ڕابەرایەتیی فیترەت و سروشت لە خەیاڵە كاڵ و خاوەكانی قوتاری دەبێت و، بە ئیسلام ئاشنا دەبێت كە ڕێگای فیترەتە، لە ڕوویەكەوە ئەمەش جوانی و سەرنجڕاكێشیی تایبەت بە خۆی هەیە. تەنانەت چونكە هێشتا ئەمانە سێبەری ئولفەت و لەگەڵ ڕاهاتن نەیگرتوونەتەوە، لەوانەیە لە موسڵمانێتییەكەیاندا تامێكی جیا و، پاراوییەكی جیا و، شیرینییەكی جیا هەبێت. بەڵام ئەم جۆرە كەسانە زۆر نین. بەگشتی ئەوانەی كە لە شوێنانی دوور لە ئەودا گەورە دەبن، ناتوانن شێواز و ناوەڕۆكە تایبەتەكەی بزانن و، تایبەتمەندییە ناوازە و ئەسڵییەتە نایابەكەی ناناسن.

هەر دنیایەك هەناسە لاهووتییەكانی ئەوی پێ بگات بەهەشتە و هەر مرۆڤێكیش لەو دنیایەدا بژی بەهەشتییە. ئەو كەسانەی بە شعوور و هەستیان ئەو دەپێون و دەیناسن، لەودا شتانی نائاسایی و

موعجیزەگەلێك دەدۆزنەوە کە لە هیچ شتێکی تردا دەستیان ناکەوێت. ئەوانەی بەم هەستەوە بەنێو هەرێمی ڕۆشنی ئەودا هەنگاو دەنێن، بە هەر جێگایەکدا بڕۆن، بەدرێژایی ڕێگا کانیاوگەلێکی ئەفسوونایی دەبینن کە خوڕەیان دێت.. دەبینن ئاوەکان، بایەکان، چیاکان، دەشتەکان هاتوونەتە زمان و لەگەڵیان دەدوێن. وەك دەنگێك و وەك مۆسیقایەك هەست بە هەموو ڕابردووی شکۆدار دەکەن لە ڕۆحی خۆیاندا.. ئەم گەشتیارانە لەم هەرێمە ڕووناکەدا ڕۆژانی ڕابردوو و ڕەنگە گۆڕاوەکان وەك ئەوەی بەسەرنەچووبن و هەرگیز گۆڕانیان بەسەردا نەهاتبێت، سەرلەنوێ و دووبارە تیایدا دەژیێنەوە.. وەك بڵێی هەموو ڕۆحێکی فانی لەودا ڕەهەندێکی نەمریی دەبینێتەوە و دەلاقەیەك واڵا دەکات بەڕووی ئەبەدییەتی ئەودیودا.

ئەو ڕۆحە سەرگەردانانەی لێرە و لەوێ دێن و دەچن، کاتێك بگۆڕێن بە چەند سینەیەکی کراوە بەڕووی شەماڵە نەرم و نیانەکانی ئەودا، ئەوکات بە خۆیان دەڵێن "ئەمە ئەو دنیایەیە کە لە خەون و خولیاکانماندا بەدویدا دەگەڕاین!"، هەست و بیرکردنەوەکانیان لە هەرێمی زیندوو و، ڕەنگاوڕەنگ و، فراوان و، بەهارئاسای ئەودا بەرەڵا دەکەن، هەرچەندە فانین، کەچی چاویان بەڕووی نەمریدا بێدار دەبێتەوە.

ئەو کەسانەی دەچنە ناو هەوا و ڕووناکی یاقووتیی و هەرێمی ئەفسوونایی ئەوەوە، زۆرجار لە بەردەم خۆیانەوە بە سەرسوورمانەوە دەڵێن "چۆن و بۆچی زۆربەی مرۆڤایەتی دەتوانن بێباك بن بەرامبەر ئەم دنیا بەهەشت ئاسایە و، هەتا سەر ئێسقان هەست بە هەناسە ژیانبەخشەکانی ئەو ناکەن..؟" بەڵێ، لەکاتێکدا ئەو بە ئاشکرا هەموو پێداویستییەکانی

ڕۆحمان پێ دەڵێت و، وەکو قووڵترین و خەمگینترین ئاواز بێئاگایی و خەیاڵی ڕۆیشتوومان کوناودەر دەکات، چۆن دەتوانین بێ باك بین بەرامبەر بەم نەفەسە پڕ لە جۆش و خرۆشانە؟! چۆن دەتوانین بێ ئاگا و بێ باك بین بەرامبەر بەو جوانییە بەتامانەی لەو ڕۆژەوەی لە ژیان تێگەیشتووین لەبەر چاوماندا دەیدوورێت و، دەینەخشێنێت و، دەیبریقێنێتەوە و، دڵەکانمان دەخاتە تەپە تەپ؟!

لە دنیای ئەودا هەموو شتێك وەك ئەوەی سیحرێکی عاشقانەی لێ کرابێت ئەفسووناوییە. ڕۆژ لەنێو سیحری ئەم ئاسمانە شینەوە لەدایك دەبێت، دەدرەوشێتەوە، یەك لەدوای یەك بە بۆیاخەکانی ڕەنگی دڵەکان دەکات، ئنجا دەڕوات.. شەو وەك ئەوەی بزمار بە قووڵاییەکانی مرۆڤدا دابکوتێت بە خۆی و کۆمەڵێك هەستەوە دێت و بەرەو تێڕامان و بیرکردنەوە ڕاپێچمان دەکات، پاشان مشتێك پشکۆ لە دڵان دەهاوێت و دەڕوات.. سەحەر بە شیرینترین دەنگ و، بۆن و، شنەباوە مرۆڤ لەباوەش دەگرێت.. بۆنی باخ و باخچەکان، دڵۆپ دڵۆپ جریوەی چۆلەکەکان کە وەك سێبەر تاوێك دەردەکەون و تاوێك ون دەبن.. گاهـ ڕاستییەکان تێکەڵی سێبەرەکان دەبن و، گاهیش سێبەرەکان دەبن بە ڕاست. بەڵێ، هەموو ئەمانە دەڵێی بەستەی سەرسووڕمان و ڕاچڵەکینێکن.

ئەوانەی لە جیهانی بیرکردنەوەیاندا توانیویانە بگەن بەم ئاستە، وا هەست دەکەن بە مەبەستی گەشت و سەیران ڕوویان لە قەدپاڵەکانی بەهەشت کردووە و، لە دڵیاندا هەناسەکانی عەشق و ئەبەدییەت دەبیستن و، کاتێك تێدەگەن بۆ هەمیشەیی بەدیهێنراون لە خۆشی و شادیدا سەراسیمە دەبن.

هەموو شتێك لەدایك دەبێت، پێدەگات، تەمەنی سروشتیی خۆی تەواو دەکات و، گەڵای دەوەرێت و، لەناودەچێت. بەڵام ئیسلام لە هەمان پاراویی خۆیدا دەدرەوشێتەوە و وەك جوانخاسێك پێدەکەنێت.. بەڵێ، ئەو هەموو دەمێك گەنج و، بەهێز و، زیندووە و، خاوەنی بەرزی و مەزنییەکی وایە کە فانی بوونی ئێمەی تێپەڕاندووە. ئەگەر جاروبار بەهۆی هەندێك ڕەشەباوە لەرزبێت و زەرد هەڵگەڕابێت، لەڕاستیدا ئەوە ئێمەی نوێنەر و شوێنکەوتووانی خەتاباری ئەوین کە لەرزەمان پێ کەوتووە و خەزان زللەی لێ داوین. ئەگینا جیهانی ئەزەلیی ئەو هەردەم درەوشاوە و، سەرنجڕاکێش و، ئاڵ و والآیە.

هەرچی نوێنەرە ڕاستەقینەکانی ئەویشە، هەمیشە لە حەز و شەوقێکی قووڵی بەیەك شادبوونەوەدا دەجۆشێن و، بە بەردەوامیی لەناو هەستێکی ئاخیرەتیی سەرنجڕاکێش و جواندا ژیان بەسەر دەبەن. لە بەرامبەر ئەو گورزە تیشکانەوە کە بێ بچڕان لەودیوەوە بەسەریاندا دەبارێت، وەکو ئەو گوڵانە وان کە سینەیان بۆ بارانی بەهار والآ کردووە. لە چواردەوری ئەواندا هەموو ساتێك ڕووناکییەکی جیا و، ئاهەنگێکی جیا و، گۆرانییەکی جیا دەبیسترێت.

لەم دنیا ڕەنگاوڕەنگەی باوەڕدا، ئەگەر لەشساغیی و لاوێتیی بتوێتەوە و بڕوات، ئەگەر پیری و هەستی جوودایی وەك کزەبا دەست بە هەڵکردن بکات، ئەگەر ناڵەی خەمگینی دابڕان لە هەموو لایەکەوە ببیسترێت، ئەگەر ڕۆژانی گەرموگوڕ و جوان جێی خۆیان بۆ شەوانی سارد و سڕ چۆڵ بکەن، ئەگەر لە هەموو لایەکەوە دەنگی پێیەکان نەمێنن و بێدەنگیی دەست بە قسەکردن بکات، ئەگەر کات، شوێن،

ڕەنگ، ڕووناکی بەسەریەکدا تێکەڵاو ببن و تەواو گرفت ببن و نهێنییان نەکرێتەوە، ڕۆحێك کە خاوەنی جووتێك باڵی ژیانی موسڵمانانەیە، وەك جەنگاوەرێك کە لە مەیدانی جەنگدا یەك لەدوای یەك دوژمنەکانی خستبێت و، ئاڵاکەی لە سنگی دوژمندا چەقاندبێت، بەهۆی ئیمانەکەیەوە خاوەنی چەقەهێزێکی وایە کە دەتوانێت هەموو ئەم حاڵەتە ناخۆش و نەخوازراوانە بە ئاسانترین شێوە ببڕێت و، دەتوانێت لەو بەهەشتەدا بژی کە لەناو ڕۆحیدایە. تەنانەت لە ڕوویەکەوە جیهانی ڕۆح و هەستی ئەوانەی کە گەیشتوون بەم ئاستە بەرزە، لە خەزانی تەمەندا زیاتر بەهێز و پتر قووڵ دەبێت.. هزر و خولیاکانیان ئەوەندەی تر باڵ دەگرن، وەك ئەوەی بەیەکجاری لە ماددییەت و جیسمانییەت ڕزگاریان بووبێت و، بووبن بە پارچەیەك لە ڕووناکی و هەڵم، بەرز دەبنەوە بەرەو ئاسمان و لەگەڵ ئەمریدا دەستلەملانی یەکتر دەبن.

لەم دوایین ساتانەی ژیاندا کە جودایی لە کەسان و شتانی خۆشەویست ڕۆحمان دەهەژێنن و، دڵمان دەشکێنن و، هەستی لەناوچوون و نائومێدیمان تێدا بەئاگادێنن و، دنیای هەستەکانمان نوقمی تاریکی دەکەن، لە بەرامبەر ئەم هەموو ڕووداوە ناخۆشانەدا ژیانی موسڵمانانە، لەو جێگایەدا کە زایەڵەی ئارەزووی ئەبەدییەتی ڕەگداکوتاوی نێو سینەمان لەگەڵ بیروباوەڕی "زیندووبوونەوەی دوای مردن"دا یەکدەگرن، دەبێت بە هێزێکی هێندە سەرسوورهێنەر و سەرچاوەیەکی هیوای وا، کە هیچ مۆسیقا و هۆنراوەیەك کە لە ناخی ویژدانی مرۆڤەوە بێنە دەر ناتوانن وەکو ئەو قووڵ و، جوان و، بەنرخبن.

ئەمانە هەریەکەیان زمانێکی مەحرەمن و لەگەڵ ڕۆحی مرۆڤدا گفتوگۆ دەکەن. دەربڕینەکانیشی دەنگ و وتە لەو وشانە وەرناگرن کە ئێمە پێیان ڕاهاتووین. ئەم زمانەی کە ڕستەکانی لەو مانایانە چنراون کە لەودیوەوە دێن، کەرەستەکەی بریتییە لەو دەنگ و وشانەی کە لەودیو جیهانی ماددەوە وەرگیراون و، زمانی فریشتەکان و زمانێکی پڕ لە ئیلهامی وایە کە تەنها مرۆڤە ڕاستەقینەکان و بابایانی چێژی لەددونییی دەتوانن لێی تێبگەن.

لەناو شەپۆلەکانی ئەم زمان و دەربڕینەدا، جاروبار هیوایەك، سیحرێك، سەودایەك دڵەکانمان دەتەنێت و، چاوەکانمان پڕ دەبن لە جوانییە سەرسووڕهێنەر و ڕووناك و ناوازەکانی دواڕۆژ و، لەم سەروبەندەشدا دەنگدانەوەی مۆسیقای عەشق و جوانی دەبیستین لە گوێکانماندا...

# نەزانیی

ئەمێستا کاتێك لە لێواری تێگەیشتنداین لە وەرزێکی نوێی ئەرك و فەرمانەکانی سەر شانمان، دڵمان پڕە لە عەشق و هیجرانی زولەیخا و، ئازار و ژانی یەعقووب و، چاومان لە ئاسۆ بڕیوە و چاوەڕوانی مژدەگەلێکین دڵمان خۆش بکات.

ئایا دەکرێت لە بەرامبەر حاڵی جەرگبڕی خەڵکی خۆماندا کە کارەساتەکان کردوونی بەژێرەوە و، پەلەقاژێیانە و، لافاوی ساڵانی مەرگ و تاریکیی پێش خۆی داون، خەم نەخۆین و ئازار نەکێشین؟

بڕۆن! یەك یەك ئەو وڵاتانە بگەڕێن کە لەسەر هەمان خەتی ئێمەن! دڵنیام، بە جەرگی پڕ لە بوریانەوە نەبێت ناگەڕێنەوە! لە شارە هەرە گەورەکانەوە هەتا شارە بچووکەکان، لە شارۆچکە هەرە قەرەباڵغەکانەوە هەتا گوندە چەپەك و دوورەدەستەکان، هیچ شار و هیچ جێگایەك نییە کە نەزانیی تیایدا فەرمانڕەوا نەبێت و، شایەتحاڵی کۆمەڵێك کێشەی کۆمەڵایەتیی نەبن کە شێوەی چەند گەرداوێکیان وەرگرتووە

و کۆمەڵگەکان هەڵدەلووشن. چەندین نەخۆشیی درێژخایەن دەبینن کە وەختی خۆی هەوڵی چارەسەرکردنیان نەدراوە و، ئەمڕۆ هەریەکەیان وەك گانگرینێکی لە دەست دەرچوویان لێ هاتووە.

بەڵام لەناو سەرجەم ئەم نەخۆشییانەدا ئەوەیان کە لە هەموویان زیاتر بونیادی میللیمان دەشێوێنێت و، بوونمان فشەڵ دەکات و، دەردێکی بێ دەرمانە، نەزانییە. نەزانیی کە بە مانای نەزانینی شتێك، سوود وەرنەگرتن لەو شتانەی دەزانرێن، بێبەش بوون دێت لە بیروباوەڕی حەق، لە هەموو سەردەمێکدا سەرچاوەی نەهامەتییەکان بووە. ئێمەش وەك هەر نەتەوەیەکی تر هەتا ئەم کانییە شوومە وشك و کوێر نەکەینەوە و، خەڵکان نەگەیەنرێن بە ڕووناکی و، نەوەکان بەرەو بیری میللی و هەستیاریی مێژوویی ئاڕاستە نەکرێن و، هەروەها هەتا ڕێگە لەو تەوژمە سەلبییانە نەگیرێت کە پێچەوانەی "ڕەگی ڕۆحیی" نەتەوەن، ئەستەمە لەو ئاژاوە و قەیرانانە ڕزگارمان ببێت کە گشت لایەکی کۆمەڵگایان تەنیوە و، قوتارمان ببێت لەو نەخۆشییانەی کە بازنەیەکی داخراوی خراپەیان بە چواردەورماندا دروست کردووە.

مەگەر هەر بەهۆی نەزانییەوە نەبوو کە ئەم نیشتمانە جوانەمان گۆڕی بە وێرانەیەك و، سوودمان لە بەپیتترین دەشت و، بەفەڕترین پێدەشت و، ڕووبارە یاقووتییەکانی وەرنەگرت! ئەم وڵاتەی کە هەموو سووچێکی "باخی ئیرەم"ە، ئێمە بێئاگابووین لە سەرجەم ئەو گەنجینانەی لە سنگیدا شاراونەتەوە و، سوودمان لە خاکی خۆمان وەرنەگرت و، نەمانتوانی کانزاکانی ناوی بەکاربهێنین. لە هەموو ئەمانەش خراپتر باوەڕمان کرد بەوەی کە هیچ کارێك لە دەستمان نایەت و، هیوا و

ئیرادەمان لەدەستدا. وە ئەو نەزانییەی کە لە ناوەوە جەستەی نەتەوەی کرمێ کردووە بە خۆی و تاریکییەکانیەوە هەتا ئەم ڕۆژگارەمان درێژەی کێشا.

لەم سەردەمە نوێیەدا کە ئومێدی ڕزگاربوونی نەتەوە بەدیار کەوت و، زانستەکان بەرەو پێش چوون، مرۆڤی ئێمە دووچاری گەرداوێکی جیاوازتری نەزانیی بوو. هەندێك لەوانەی کە لە بەرامبەر پێشکەوتنی زانستیی و تەکنەلۆجیی هاوچەرخەکانماندا سەریان گێژی خوارد و چاویان بەر شەوارە کەوت، بە خەیاڵی ڕزگارکردنی نیشتمان، لەبری ئەوەی دڵان لە باوەڕ و، ژیرییەکان لە زانست و حیکمەت پڕبکەن و، هەر چوار لای وڵات بە هونەر و بازرگانیی ئاوەدان بکەنەوە، وایانزانی بە خستنە ژێر پێی بیری میللی و، سووکایەتیی کردن بە فەزیلەت و ئەخلاقی نەتەوە، دەتوانن بگەن بە ئاستی شارستانێتیی هاوچەرخ و، بێبەزەییانە چەندین کودەتایان بەسەر ڕۆحی نەتەوەدا ئەنجامدا. لە ڕوویەکەوە ئەم نەزانییەی دووهەم سەبارەت بە وڵاتەکەمان و مرۆڤەکانی ناوی ترسناکتر و وێرانکەرتر بوو. چونکە ئەوەی یەکەم بریتی بوو لە دواکەوتنی زانستیی، بەڵام ئەمەی دووهەم بە ناوی زانست و شارستانێتییەوە دەیتوانی سەر بە هەموو شوێنێکدا بکات و، لە گشت جێگایەکدا پێشوازیی گەرمی لێ دەکرا و، بە چەپڵەڕێزان بەخێرهاتنی دەکرا. یەکەمیان سەرتاپای نیشتمانی کردبوو بە وێرانەیەك و تەنها دڵی بایەقوشەکانی خۆش کردبوو. وەلێ ئەمەی دووهەمیان بە یەکجاریی فەزیلەت و، نەجابەتی ڕۆح و، هەستی فیداکاریی نەتەوەی گسك لێ دا و، نەوەکانی گیرۆدەی سەرسامیی و سەرگەردانیی کرد.

پێویستە ئەو پەروەردەکار و ڕێنیشاندەرانەی کە کەفالەتی ئامادەکردنی ئاییندەیان خستووەتە سەر شانی خۆیان، جەنگ لە دژی هەردوو جۆرەکەی نەزانیی ڕابگەیەنن و، تەنانەت لەم پێناوەدا هەموو هۆکارێکی ڕێ پێدراو بەکاربهێنن و، بۆ ساتێك دوا نەکەون لە هەوڵی ڕزگارکردنی ئەم وڵاتە و مرۆڤەکانی ناوی و ئاڕەستە کردنیان بەرەو ڕووناکی. لەبەر ئەوە پێویستە هەر لە خێزانەوە هەتا قوتابخانە، هەر لە چایخانەوە هەتا سەربازگە، هەموو نیشتمان بکرێت بە خوێندنگایەکی گشتیی. پێویستە بچینە شەڕەوە لەگەڵ نەزانیی و، بێ بڕیاریی و، چاولێکەریی و، بێئاگایی لە کلتوور و سەربەزییە میللییەکان و، سەرلەنوێ ئەو بڕیارانەی کە لە پێشینە و بێ لێکۆڵینەوە دراون بخرێنە ژێر وردبینی ڕەخنەوە و، ڕوانگەیەکی نوێ بدرێت بە زانستەکان.

بێ هیچ گومانێك لەم بارودۆخەدا ڕابەرانی ئەم ئەرکە پیرۆزە مامۆستایان دەبن. ئەو مامۆستا بەختەوەرانەی کە هاوسەنگیی نێوان ڕۆح و لاشە لە مرۆڤدا ڕادەگرن و، ڕەچاوی پێگە و پایەی مرۆڤ دەکەن لەناو بوونەوەراندا و، بە ئاڕاستەی ئامانجی بەدیهاتن دڵەکان فێری فڕین دەکەن و، ئاشکرا و پەنهان وەك دوو ڕووی یەك حەقیقەت تەماشا دەکەن..!

بەڵێ، ئەو ڕەهبانییەتەی کە ئینکاریی جەستەی ئادەمیزاد دەکات، چەند زیانبەخشە بۆ نەوەی مرۆڤ، ئەو سیستەمە فەلسەفییانەش کە مرۆڤیان تەنها لە لاشە و ماددەکەیدا بچووك کردووەتەوە بە ئەندازەی ئەو، بەڵکو خراپتریش، زیانیان پێ گەیاندووە. ئایا دەگونجێت هەست نەکەین بەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی ناوازەیە و، شوێنێکی گرنگیی

له گه‌ردووندا گرتووه و، تێنه‌گه‌ین له‌وه‌ی كه له ڕووی به‌دیهاتنییه‌وه چه‌ندین ئه‌ركی گرنگ نراوه‌ته سه‌ر شانی و، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م هۆیه‌ش كاندیده بۆ به‌ده‌ست هێنانی چه‌ندین پله و پایه‌ی جۆراوجۆر..؟

به‌دیهاتوویه‌ك كه توانای سوود وه‌رگرتنی هه‌یه له هه‌موو جۆره‌كانی زانست، شه‌ره‌فمه‌ند كراوه به به‌هره‌ی ده‌ست وه‌ردان و ڕێكخستنی بوونه‌وه‌ر و ڕووداوه‌كان و، به "مه‌له‌كه"ی جۆراوجۆر پڕچه‌ك كراوه به مه‌به‌ستی تێگه‌یشتن له هه‌موو شێوه‌كانی جوانی و، ده‌زانێت چێژ و له‌زه‌ته جۆراوجۆره‌كان له یه‌كتر جویێ بكاته‌وه و، ڕۆحی به سه‌ودای ئه‌به‌دییه‌ت سه‌رخۆشه و، دڵی ناڵه‌ی "ئه‌به‌د، ئه‌به‌د!"ی لێ به‌رز ده‌بێته‌وه.. ئایا به‌دیهاتوویه‌كی له‌م جۆره چۆن ده‌كرێت بێ ئه‌رك و بێ ئایینده بێت..؟ بینینی ئه‌و وه‌ك بوونه‌وه‌رێك كه خاوه‌نی فه‌رمانێك نییه و لێپرسراوێتیی نییه و پاشان مه‌حرووم كردنی له داهاتوویه‌كی دوور و درێژی لێوانلێو له كامه‌رانیی، مانای وایه ئه‌م به‌دیهاتووه هه‌ره به‌ڕێزه ده‌هێنرێته ئاستی زینده‌وه‌رانی تر و، ئینكاریی له توانا و لێهاتن و هه‌سته ماددی و مه‌عنه‌وییه‌كانی ده‌كرێت و، ڕێگا هه‌ره سه‌خت و ئاڵۆزه‌كانی پێ نیشان ده‌درێت و، دنیاكه‌ی وێران و خاپور ده‌كرێت. نازانم داخۆ ئاده‌میزاد ده‌توانێت ته‌سه‌ووری سته‌م و ناحه‌قییه‌كی له‌مه گه‌وره‌تر بكات..؟

به ڕای ئێمه مامۆستا و ڕێ نموونیكاری ڕاسته‌قینه ئه‌و كه‌سایه‌تییه به‌خته‌وه‌رمیه كه ڕاستیی فێری ئه‌م مرۆڤه -كه توانا و لێهاتنی ئه‌وه‌ی پێ دراوه ببێت به هه‌موو شتێك و ڕه‌وانه‌ی دنیا كراوه- ده‌كات و، پیشانی ده‌دات چۆن ڕاست بیریكاته‌وه و، جۆش و خرۆش ده‌دات به ڕۆحی و په‌رواز به دڵی ده‌كات و، هه‌موو ئه‌و به‌ربه‌ست و كونه ڕه‌شانه له‌ناو ده‌بات كه ڕێی پێ ده‌گرن و، ده‌یگه‌یه‌نێت به ده‌روازه ڕووناكه‌كان.

کاتێك وەختی خۆی هات بەرد و خاك لە دەستی ئەم پاڵەوانەی حەقیقەتدا دەبێت بە ئاڵتوونی نمرە یەك و، ئەو شتانەی بێنرخ دەردەکەون بایەخ پەیدا دەکەن و، ڕۆحە هەرە تاریکەکان دەگەن بە ڕووناکی و، ئەوانەش کە کۆیلەی نەفسیان بوون هەریەکەیان بە بەرزبوونەوەی ڕۆحیان دەگۆڕێن بە سوڵتانێك.

چەند پیرۆزە ئەو مامۆستایەی کە خۆی بۆ ئیرشاد و تەبلیغ تەرخان کردووە و، هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ شاگردەکانیدا دەڕوات و، لە هەر قۆناغێکی ژیاندا بە هەیەجانی بەرزکردنەوەی ئەوان بۆ ئاستی مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە دڵی قوڵپ دەدات و، دەتوانێت بەهۆی وردبینی زانستەکانەوە حەقیقەتی ڕەهایان نیشان بدات و، جارویار وەك هەورەبروسکە بگرمێنێت، بەڵام دواتر بەو گورزە ڕووناکییەی کە لە دڵیدا مالیی و دەستەمۆی کردووە، دڵی خوێندکارەکانی پڕ بکات لە نوور..!.

# پارچە ئاڵتوونییەکانی

# کات

## محمد فەتحوڵڵا گولەن

دنیا چەند بگۆڕێت و چ حاڵەتێك وەربگرێت، زانست و هونەر چەند پێش بکەون، تێگەیشتن و جیهانبینیی ئادەمیزاد چەند گۆڕانی بەسەردا بێت، هێشتا هەستی ئایینیی هەروەك بەدرێژایی مێژوو لە دامەزرانی ژیانی زانستیی و فیکریدا و، لە لەدایکبوون و گەورەبوونی شارستانێتییە نوێیەکاندا و، لە کامڵبوونی مرۆڤایەتیدا یەکەم هۆکار و فاکتەر بووە، ئەمڕۆش هێشتا بە هێزە ئەفسووناوییەکەی لە بەشێکی زۆری ئەم دنیایەدا وەکو یەکەمین هۆکار بەردەوامیی بە کاریگەریی خۆی دەدات و، گرەویش لەسەر هەمان کاریگەریی دەکات لە داهاتوودا. دوو گەورەترین شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە یەکێکیان هی موسڵمانەکانە و ئەوی تریان هی مەسیحییەکانە، ئەمەش زیندووترین و بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر قسەکانمان.



9 649750 000543
IRFAN
نرخی ۳۰۰۰ دینارە